گۆڤاری زانکۆ بۆ زانستە مرۆڤایەتییەکان
ISSN (Print):2218-0222
ISSN (Online): 2412-396X

Vol.28 Issue3 2024
ID No. 1651 (PP 179-193)
https://doi.org/10.21271/zjhs.28.3.10

توێژینەوە

# ڕەنگدانەوەی دۆزی کورد لە ڕۆژنامەی مەعاریفی ئیسرائیلی (1968-1961)

**قارمان حیدررحمان/** بەشی مێژوو کۆلێژی ئاداب ، زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر

**ئارەزوو یوسف حسن /** بەشی مێژوو کۆلێژی ئاداب ، زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر



## پوختە

ئەم توێژینەوە تایبەتە بە دۆزی کورد لە ڕۆژنامەی مەعاریف لە ماوەی ساڵانی (١٩٦١-١٩٦٨) دا، جەختیکردۆتەوە لەسەر هەڵوێست و بایەخدانی دۆزی کورد لە ڕۆژنامەکە، هاوکات سەرنج خراوەتە سەر دیوی ناوەوەی ڕووداوەکان لە چوارچێوەی هەواڵ و داتا تایبەتیەکانی ڕۆژنامەکە، بەهۆی ئەوەی ڕۆژنامەی ناوبراو سەنگ و پێگەیەکی دیاری هەبووە لە بواری ڕاگەیاندنی جیهانیدا، بەگشتی توێژینەوەکە لە پێشەکیەک و سێ تەوەر پێکهاتووە، لە تەوەری یەکەمدا لەگەڵ ئەوەی پوختەیەک لە بارەی مێژووی ڕۆژنامەکە و شێوازی دەرچوون و دەستەی نووسەرانی باسکراوە، ئاماژە بە ناوهێنانی کورد لە ڕۆژنامەدا کراوە، لە تەوەری دووەمیدا دۆزی کورد لە دوو ماوەی جیاوازدا باسی لێوەکراوە، لەسەرەتا باس لە ڕەنگدانەوەی شۆڕشی کورد لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٦١-١٩٦٣ کراوە، تیایدا پشت بەداتاکانی مەعاریف بەستراوە لەکردە سەربازییەکاندا، لەتەوەری کۆتایی ئاماژە بە هەڵوێست و ڕەنگدانەوەی پەیوەندی کورد و حکومەتی عێراق لە (٨ی شوباتی ١٩٦٣- ١٧ تەمموزی ١٩٦٨) لە ڕۆژنامەی مەعاریفدا کراوە.

CORRESPONDENCE
ئارەزوو یوسف حسن
arazu.hasn@su.edu.krd

وەرگرتن 2023/12/23
پەسندکردن 2024/04/14
بڵاوکردنەوە 2024/06/15

**وشە سەرەکییەکان:**
کورد،
ڕۆژنامەی مەعاریف،
هەڵوێست،
شەڕ
حکومەتی عێراق.



**About the Journal**
ZANCO Journal of Humanity Sciences (ZJHS) is an international, multi-disciplinary, peer-reviewed, double-blind and open-access journal that enhances research in all fields of basic and applied sciences through the publication of high-quality articles that describe significant and novel works; and advance knowledge in a diversity of scientific fields. https://zancojournal.su.edu.krd/index.php/JAHS/about

**پێشەکی:**

ڕۆژنامەی مەعارف بە یەکێک لە ڕۆژنامە دیار و گرنگەکانی بواری ڕۆژنامەوانی جیهانی هەژمارکراوە، لەڕووی بایەخدان بەهەواڵ و خستنە ڕوو زانیارییەکان و ناساندنی کێشەکان بە جیهان، لەم نێوەندەشدا ڕۆژنامەکە هاوشێوەی ناوچەکانی دیکە بایەخی بەدۆزی کورد داوە کە لەو ماوەیەدا لە چوارچێوەی بزاڤێکی رزگاریخوازی نەتەوەیی لە باشووری کوردستان خراوەتەڕوو، لەم ڕوانگەشەوە لە ناساندنی کێشەی کورد و مێژووی نەتەوەیی کورد کەم تا زۆر ڕۆڵی بینووە، ئەمەش گرنگی تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوە و زانینی ڕووداوە مێژووییەکانی ناوچەکە و سیاسەت و هەڵوێستی دەوڵەتان لەبەرامبەر بە دۆزی کورد هەیە.

پێکهاتەی توێژینەوەکە: لە چوارچێوەی سێ تەوەردا هەواڵ و زانیارییە مێژووییەکان لە ماوەی ساڵانی ( ١٩٦١-١٩٦٨) لە خۆگرتووە. لەسەرەتادا بە کورتە باسێک لە بارەی ڕۆژنامەی مەعاریف و چۆنیەتی دەرچوونی رۆژنامە کە و دەستەی نووسەرانی زانیاری دەخاتەڕوو ،دواتر باس لە قۆناغە بەراییەکانی گرنگیدانی ڕۆژنامەکە دەکات بە ناساندنی دۆزی کورد ، لە تەوەری دووەمیشدا تیشکخراوەتە سەر ڕەنگدانەوەی شۆڕشی کورد (١٩٦١-١٩٦٣) لە ڕۆژنامەی مەعاریف، لەو تەوەرەدا سەرباری پەیوەندییەکانی حکومەت و لایەنی کوردی و کردەسەربازییەکان کراوە. لە تەوەری سێیەمدا: تیشکخراوەتە سەر لایەنێکی دیکەی دۆزی کورد ئەمەیش پەیوەندی کورد و حکومەتی عێراق (٨ی شوباتی ١٩٦٣- ١٧ تەمموزی ١٩٦٨) لە رۆژنامەی مەعاریفدا، تێدا جەخت کراوەتە سەر هەڵوێستی ڕۆژنامە و هۆکاری گرژی و ئاڵۆزییەکان و سیاسەتی نێو دەوڵەتی لەم ماوەیە مێژووییە هەستیارەدا.
سەرچاوە سوود بەخشەکانی توێژینەوەکە : لەم توێژینەوە بەیلەی یەکەم پشت بەستراوە بە رۆژنامەی مەعاریف ، بەهۆی بایەخدانی ڕۆژنامەکە بە دۆز و شۆڕشی کورد ، لە هەمان کات سوود لە هەندێ ژێردەر و ڕۆژنامەی دیکە وەرگیراوە.

**هۆکاری هەڵبژاردنی بابەتەکە:** هەڵبژاردنی بابەتەکە بۆ دوو هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە:
یەکەم: هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ هەستیاری باسکردنی ماوەیەکی گرنگی مێژوویی لە گۆشەی ڕۆژنامەیەکی بیانی و دەرەکی، نیشاندانی ڕەوشی ناوچەکە و هەڵوێستی وڵاتان و ڕۆژنامەکەیە لەبەرامبەر دۆزی کورد، سەرباری دیاریکردنی خاڵە ئەرێنی و نەرێنیەکانی سیاسەتی وڵاتانە لە بەرامبەر بە ڕووداوەکانی ناوچەکە بەگشتی و دۆزی کورد بە شێوەیەکی تایبەت.
هۆکاری دووەم هەوڵدانە بۆ :دیاریکردن و ناساندنی ڕووداو و شیکردنەوەی هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی ئیسرائیلە بەرامبەر بە دۆزی کورد.

**میتۆدی توێژینەوەکە:** سنووری تویێژینەوەکە: سنووری تویێژینەوەکە قۆناغی شۆڕشی کورد لە ساڵانی (١٩٦١- ١٩٦٨) گرتووەتەوە، تێدا جەخت کراوەتەوە سەر پەیوەندییەکانی حکومەتی عێراق و سەرکردایەتی کورد لە هەردوو باری شەڕ و بەرەنگاربوونەوە و ماوەی دانووستاندن و هەوڵەکانیان بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانەدا.

**١/ سەرەتاکانی ناساندنی دۆزی کورد لە ڕۆژنامەی مەعاریف:**

**١-١ / ناساندنی رۆژنامەی مەعاریف:**

لەسەرەتادا ئەم ڕۆژنامەیە بە ناوی ( یەدعوت مەعاریف) دەرچووە، ئەم ڕۆژنامەیە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی، بە دووەم ڕۆژنامەی دیار و پرۆفرۆشی ڕۆژانەی ئیسرائیل داندراوە، یەکەم ژمارەی بە زمانی عیبری لە(١٥ی شوباتی١٩٤٨) لە شاری ( تەل ئەبیب) ی پایتەختی ئیسرائیل بڵاوکرایەوە ،کە لە (١٢) لاپەڕە پێکهاتبوو. ڕۆژنامەکە زیاتر هەواڵی ڕۆژانەی ئیسرائیل و ناوچەکانی دیکەی جیهانی بڵاوکردووەتەوە، سەرباری بڵاوکردنەوەی هەواڵی ئابووری و وەرزشی و تەندروستی و تەکنەلۆژیایی. ڕۆژنامەکە لەسەر دەستی ژمارەیەک لە ڕۆژنامەنووس و نووسەرانی جوولەکە بەسەرپەرشتی (عزرئیل کارلباخ) دامەزرا. لەمانەش( شالوم روزنفیلد، شموئیل سنیتزر، دیڤید لازار، دیڤید جلعادی، ئوری کیساری، ئەریە دیسنیشیک) (دینور ،٢٠٠٩،ل.٢٥-٣٣). تیراژەکەی لەسەرەتای دەرچوونیدا ڕۆژانە (٣) هەزار بووە، دواتر ڕۆژنامەکە ناونیشانەکەی گۆڕدراوە بۆ (یەدعوت مەعاریف) بۆ (مەعاریف) و هەریەک لە (موشیە زاک، یەهوشوا یوستمان) ڕۆڵیان لە دامەزراندنیەوە تاوەکو ناوەڕاستی حەفتاکان بینووە، مەعاریف بەربڵاوترین ڕۆژنامە بووە لە ئیسرائیل. ئەم ئاڕاستەی ڕۆژنامەکە پیادەی کردووە، ئاراستەیەکی چەپی سەهیۆنی بووە. (کارلباخ) یەکەم نووسەری ڕۆژنامەکە بووە (مەعاریف، ژ(١٠)، ١٩٤٨/٨/٥، ل١١).
-دۆزی کورد لە رۆژنامەی مەعاریفدا

وەک دەرکەوتووە ڕۆژنامەکە لە چوارچێوەی گرنگیدانی بە بابەتە سیاسییەکاندا، بایەخی بە دۆزی کورد لە عێراق داوە. دیارە یەکێک لە خاڵە هاوبەشەکانی نێوان ئیسرائیل و کورد ئەوەیە، بەشێک لە هاونیشتمانەکانی بەڕەگەز کوردبوونە. جگە لە فاکتەری

دیکەی وەک بوونی نەیارێکی هاوبەش لە نێوان ئیسرائیل و گەلی کورد لەم ماوە مێژووییەدا. کە دەسەڵاتە حوکمڕانەکانی سوریا و عێراق بوون(أحمد،2014،ص٢٣١)، ئەوانەی بەدیدێکی تەسکی ناسیۆنالیستی، سەیری داخوازییە نەتەوەییەکانی گەلی کوردییان دەکرد لە وڵاتەکانیاندا. تەنانەت دەسەڵاتدارانی بەغدا، داخوازییە نەتەوەییەکانی گەلی کوردییان لە عێراق، بەهەوڵدان بۆ جیابوونەوە و دابەشکردنی وڵاتەکە سەیر دەکرد و زۆرکاتیش وەک پلانی زلهێزەکان دەیانناساند بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی دیکەی جوولەکە لەنێو جەرگەی جیهانی عەرەبیدا، وەک هەوڵێک بۆ لاوازکردنی عەرەب لە ناوچەکە (ڕۆژنامەی کوردستان،١٩٦١،ل٥). بێگومان ئەم پروپاگەندانەی حوکمڕانەکانی وڵاتێکی وەکو عێراق بۆ کەمکردنەوەی کاریگەرییەکانی دۆزی گەلێکی بەشخوراو بڵاویان دەکردەوە، هیچ بنەمایەکی لۆژیکی نەبوو، لەبەرئەوەی گەلی کورد لە عێراق، هیچ کات داوای جیابوونەوەی لەم وڵاتە نەکردووە، بەڵکو بەخواستی خۆی لەساڵی ١٩٢٥ چووە ژێرباری ئەم دەوڵەتە(علی،2011،ص508-514)، لەسەر بنەمای باوەڕ بوون بە پێکەوەژیان لەگەڵ سەرجەم پێکهاتەکانی لەم سنوورە جوگرافییەدا هەبوون، کە دوای کۆتاییهاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی، لەساڵی ١٩٢١ بە دەوڵەتی عێراق ناسێندرا. تەنانەت گەلی کورد لەم وڵاتەدا، بەشداربوونێکی کارای لەدامەزراندنی بنەماکانی دەوڵەتی نوێی عێراق هەبوو(عبدالطالب، 2015،ص١٨٦).

وەک ڕۆژنامەی(مەعاریف) لەسەروبەندی بڵاوکردنەوەی بابەتەکانی لەسەر کورد و بارودۆخی سیاسی لەناوچە عەرەبییەکان بەتایبەتی لە عێراق، لە بابەتێکدا بەناونیشانی (هێزی سوپای عێراقی لە کوێدایە؟ ژەنەڕاڵەکانی سوپا لەبنچینەدا کوردن) لە (٥ی ئابی ١٩٤٨) باسیکردووە، لەم بابەتەدا، ڕۆژنامەکە تیشکی خستۆتە سەر هاوکارییەکانی گەلی کورد لە دامەزراندنی سوپای عێراقی نوێ و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە سەربازە ئیسرائیلییەکان جیاواز لە هێز و سوپای هەر وڵاتێکی دیکەی عەرەبی، لە شەڕدا ڕێزی زۆر لەسەرباز و ئەفسەرانی عێراقی دەگرن. لەبەرئەوەی سەرباز و ئەفسەرانی سوپای عێراقی زۆربەیان بەرەگەز کوردن. بەپێی زانیارییەکانی ڕۆژنامەکە، ئەو سەربازانە هەرچەندە لەشەڕ چەکی پێشکەوتوویان پێ نیە بەکاری بهێنن هاوشێوەی چەکی پێشکەوتووی سوپای میسری، بەڵام شەڕی دەستەویەخە ئەنجام ئەدەن، تەنانەت ئەوان لە شوێنی تفەنگ، زۆرکات لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ سەربازانی ئیسرائیل. (چەقۆ) بەکاردەهێنن بۆیە جیاواز لە پێکهاتەی سوپای هەر دەوڵەتێکی دیکەی عەرەبی، ئەوان ئازاتر دەکەونە بەرچاو. لە ساختکردنەوەی ئەم تایبەتمەندییە سوپای عێراقی، ڕۆژنامەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەفسەرانی کوردی نێو سوپای عێراقی لەسەر سیستمی سەربازی تورکی و بەمەشق و ڕاهێنانی ئەلمانی ئامادەکراون. ئەوان شارەزایی و لێهاتووی زۆریان لە پلانەکانی شەڕدا هەیە. لە نێو باسەکەیدا ڕۆژنامەکە، دەچێتە سەر دۆزی کورد لە عێراق و ئاماژە بە سەرسامی خۆیان لەبەرامبەر هەڵوێستی کوردەکان لەنێو سوپای عێراقدا دەکات. لە کاتێکدا ئەم دەسەڵاتە هەر لە ڕێگەی ئەو سوپایە، بەر لەچەند ساڵێک لە پێشتر، هێرشی کردووەتە سەر ڕاپەرینی کوردەکان لە باکووری عێراق و بەهاوکاری بەریتانییەکان، ڕاپەڕینەکەی سەرکوتکردووە، لەبەر ئەوەی دژایەتی دەسەڵاتی بەغدادیان دەکرد و داوای مافە نەتەوەییەکانی خۆیان دەکرد. ئەمەش بەپێی ئاماژەکانی ڕۆژنامەکە، هەڵوێستێکی دژ بەیەکە و لەنێو کوردەکان هەستی پێکردووە، لەکاتێکدا کوردەکان ئەوە دەزانن کە لە کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس(١٩١٩)، خاکی کورد وەک (نەختێک) بە پادشای عەرەب(فەیسەڵ) بەخشرا، بەو هۆیەوە کوردەکان بوونە بەشێک لەو پێکهاتانەی کەوتنە نێو چوارچێوەی ئەو جوگرافیایەی کەناوی عێراقە (مەعاریف، ١٩٤٨/٨/٥، ل٦ ).

ئەوەی ڕۆژنامەکە مەبەستی بووە لەم بابەتەدا بیگەیەنێ ئەوەیە، سوپای ئیسرائیل بۆیە ڕێز لە سوپای عێراق دەگرێ بەراورد بە سوپای وڵاتانی دیکەی عەرەبی، ئەوەیە بەشی زۆرینەی سەرباز و ئەفسەرانی کوردی نێو سوپای عێراقی بە ناچاری تێکەڵ بە شەڕی ئیسرائیل بوون، بەهۆی ئەو بارودۆخە مێژووییەی، زلهێزەکان لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی بەزۆر یان بەبێ ئاگایی بەسەر گەلی کوردیان سەپاندووە لە بەرژەوەندی حوکمڕانەکانی بژاردەی خۆیان بوون بۆ بەڕێوەبردنی ئەم وڵاتە.

لەسەر ئەم بنەمایە، ڕۆژنامەکە بەدوای دەرفەتێک بۆ سەلماندی ئەم ڕاستییە مێژووییە دەگەڕێت و بیکاتە پاساوێک بۆ نیشاندانی توانای جەنگاوەرانی کورد لە ڕووی سەربازییەوە، بۆیە لە درێژەی ئەو بابەتانەی بەر لەهەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لە باشووری کوردستان، لەسەر دۆزی کورد بڵاویکردووەتەوە، بابەتێک بوو لە نووسینی یەکێک لە نووسەرو ڕۆژنامەنووسە بەدیمەنەکانی بەناوی (ئەلیعازر بادامشا) بەناونیشانی (کارتی فشاری کوردی یەکێتی سۆڤیەت). ڕۆژنامەنووسەکە لەم بابەتدا بە پوختی باسی لە نیگەرانییەکانی حکومەتی ئێران و تورکیا کرد، دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ لە عێراق، بەهۆی جموجۆڵی هۆزەکان لە ناوچە کوردییەکانی کەوتبوونە سنووری وڵاتەکانیان و هاوکات مەترسی ئەم وڵاتانەی خستووەتە لەبەرامبەر پشتگیری سۆڤیەت لە مستەفا بارزانی و ئەو کۆمەڵە جەنگاوەرە کوردەی لە سۆڤیەت پاوەرییان دەکرد. لەم بارەیەوە نووسیویەتی:"لە ماوەی دوو ساڵی ڕابردوو،سۆڤیەت سوپایەکی کوردی پێکهێناوە لەژێر سەرپەرشتی مەلا مستەفا بارزانی، کە ئامانجی دروستکردنی کۆمارێکی کوردی هەیە". نووسەر لە درێژەی بابەتەکەیدا چۆتە سەر هۆکارەکانی کۆبوونەوەی کورد لە چوارچێوەی بزاڤی ڕزگایخوازی کوردیدا و لەم

بارەیەوە پێشینەیەکی مێژوویی لەسەر گەلی کورد خستۆتەڕوو، بەشێوەیەک ئاماژە بە ژمارەیان لە وڵاتانی تورکیا و ئێران و عێراق و سۆڤیەت دەکات و چەند تایبەتمەندییەکیان لە ڕووی ڕەگەز و زمان و کولتوور و ئایینزای ئایینی باس دەکات. هەر لەم باسەدا نووسەر تیشکی خستۆتە سەر سیاسەتی سەرکردەکانی مۆسکۆ بۆ سوود وەرگرتن لە توانا و لێهاتوویی شۆڕشگێرانی کورد و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە سۆڤیەت لە شارەکانی (باکۆ) و (یەریڤان) ئێستگەی کوردی دامەرزاندووە، ئەوە جگە لە دامەزراندنی (ئێستگەی نهێنی ئازەربایجان) بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامی سیاسی سەرکردە شۆڕشگێرەکانی کورد و پەخشکردنی بۆ ناوچە کوردییەکان لە عێراق و ئێران. بەمەبەستی هاندانی کوردەکان بۆ هاوکاریکردنی پارتە شیوعییەکان لە هەرێمەکانی خۆیان، بە ئامانجی دژایەتیکردنی وڵاتانی ئیمپریالیزمی وەک بریتانیا و ئەمریکا و پاشکۆکانیان لە نمونەی دەسەڵاتی حوکمڕانی پادشایەتی لە عێراقدا(مەعاریف،١٩٥٨/٩/٧، ل٣).

بەم شێوەیە ئەم ڕۆژنامەیە تا سەرکەوتنی شۆڕشی(١٤ی تەمموزی ١٩٥٨) هیچ ئاڕاستەیەکی دژ یان لایەنگیری لەگەڵ بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی نیشانەداوە، بەڵام دوای گۆڕانی سستەمی حوکمڕانی لە عێراقدا، لە ئەنجامی شۆڕشی ١٤ی تەمموز. ڕۆژنامەکە هەڵوێستی توند بەرامبەر بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد و شۆڕشگێڕانی دەگرێتەبەر و شۆڕشگێرانی کورد بە ڕێبەرایەتی مستەفا بارزانی کە لە سۆڤیەت بوون بە ئامرازی دەستی سۆڤیەت وەسف دەکات، لە بابەتێکدا کە نووسەرەکەی (ئەلیعازر بن موشیە) یە، بەناونیشانی ( مەلا مستەفا بارزانی، بۆمبی سۆڤیەتی ئامادەکراوە) و لە (٢٤ی نیسانی١٩٥٩) بڵاویکردۆتەوە، کە تیایدا نووسەر باس لە چیرۆکی ئەو ساتانەی سەردانی مستەفا بارزانی دەکات بۆ باڵیۆزخانەی عێراق لە (براغ)ی پایتەختی چیکۆسلۆفاکیا. دوای ئەوەی حکومەتی عێراق لە ساڵی ١٩٥٨ بڕیاری لێبوردنی بۆ بارزانییەکانی سۆڤیەت دەرکرد و داوای لێکردن بگەڕێنەوە عێراق. لەم بابەتەدا نووسەر وردکاری سەردانەکەی مەلا مستەفا بارزانی بۆ باڵیۆزخانەی عێراق دەخاتەڕوو، کە:" لەسەرەتای مانگی ئابی ١٩٥٨، پیاوێکی کورتەباڵای خاوەن سیمایەکی بەهێز، بەسەر پایەکانی باڵیۆزخانەی عێراق کەوت، خۆی بە سکرتێری باڵیۆزخانەکە ناساند، بۆیە ڕاستەوخۆ بردیانە ژووری باڵیۆز کە لەچاوەڕوانیدا وەستابوو پێشوازی لێبکات. باڵیۆزکە زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکرد و بە بارزانی ڕاگەیاند فەرمانم پێکراوە بە ئێوە ڕابگەیەنم کە حکومەتی کۆماری عێراق، دان بە مافەکانتان دادەنێ و وەک ڕێبەری کورد پێشوازییتان لێدەکات و بڕیاری داوە ڕێگاتان پێ بدات بەگەڕێنەوە وڵاتەکەتان لەگەڵ کەسوکارەکانتان، دوای دوورکەوتنەوەتان بۆ ماوەیەکی درێژ (مەعاریف ،4/24/ 1959، ل3).

بەم هۆیەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ڕۆژنامەکە لەسەرەتای گەڕانەوەی بارزانی، ئاڕاستەیەکی تایبەت لە بەرامبەر دۆزی کورد لە عێراق وەردەگرت، لەبەرئەوەی سەرکردایەتی کوردی بە نەیارانی بەرەی ڕۆژئاوا سەیری کردووە. بە تایبەتی دوای پشتگیریکردنیان لە شۆڕشی تەمموزی ١٩٥٨ لە عێراقدا لە دژی سستەمی پادشایەتی، کە لایەنگیری بریتانیا و ئەمریکابوون.

### ١- ٢/ ڕەنگدانەوەی شۆڕشی کورد (١٩٦١-١٩٦٣) لە ڕۆژنامەی مەعاریف.:

دەستپێکردنی شەڕو ئاڵۆزییەکانی ناوچەکە کاریگەریی کردووەتەوە سەر بواری ڕاگەیاندن بەگشتی لەم لایەنەشدا ڕۆژنامەی مەعاریف لەچوارچێوەی بایەخدان لە بابەتە سیاسیەکان لە گۆشەی ڕۆژنامەکەدا تیشکی خستووەتە سەر ئەم لایەنەوە، بۆ نموونە ڕۆژنامەی ناوبراوە لەڕێگەی بابەتێکی نووسەر (شموئیل سیجیف) بە ناونیشانی (حوکمڕانی عێراق بەرە و لە ناوچوون دەچێ بەهۆی هەڵگەڕانەوەی کورد)، لەم بارەوە دەنووسێت: لە (١٨ی ئەیلولی ١٩٦١) لەلایەن کوردانی (باکووری عێراق) شۆڕش ڕاگەیاندراوە . بەم هۆیەوە :" شاری بەغدای پایتەختی خەلافەت و نەوت، ئەم هەفتەیە توشی شۆک و حەپەسان بووە لەسەر دەستی کوردەکان، هەرچەندە پێشتر پارێزەری ڕژێمی قاسم بوونە. بەلام لە ئێستادا ئێستگەی بەغدا هەڵگەڕانەوەی کوردی لە باکووری عێراق پشتڕاست کردووەتەوە". جارێکی دیکە هەر لەم بارەوە لە دەنووسێت: هەرچەندە عێراقییەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە هەڵگەڕانەوەکەی کورد سەرکوتکراوە، بەڵام دۆخەکە پێچەوانەی ڕاستییەکانە. بەڵکو ژمارەیەکی زۆری چەکداری عێراقی لەناو شاری بەغدا بڵاوەیان پێکراوە و بەشەقامەکاندا دەسوڕێنەوە و بەشێکیان دەروازەی شارەکەیان گرتووە، ئەم دۆخەش ترس و دوو دڵی زۆری لەنێو دانیشتووانەکانی بەغدا دروستکردووە. هۆکاری هەموو ئەم مەترسیانەش ئەوەیە، کە ئەم هەڵگەڕانەوەیە جیاوازە لەگەڵ هەر هەڵگەڕانەوەیەکی دیکەی پێشووتر، کە لەسەردەمی قاسم ڕوویانداوە، لەبەرئەوەی ئەم هەڵگەڕانەوەیەی کورد کە لەلایەن مستەفا بارزانی ڕێبەرایەتی دەکرێت. ئەو ڕێبەرە بەرفراوانترین پشتیوانی جەماوەری هەیە لەنێو کوردەکان و تەنانەت لە دەرەوە زۆر بەهێزەوە لەلایەن یەکێتی سۆڤیەت پشتیوانی دەکرێت، لەبەر ئەوەی بۆ ماوەیەکی زۆر لە سۆڤیەت ژیاوە لەو کاتەی پەناهەندە بووە لەم وڵاتە و پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ سەرکردەکانی مۆسکۆ هەیە. دوای ئەوەی لە ئەنجامی سەرکەوتنی شۆڕشی تەمموزی ١٩٥٨ گەڕایەوە عێراق، توانی دەستکەوتی گەورە بۆ گەلی کورد بەدەستبێنێ لەبەغدا، بەتایبەتی دانپێدانانی حکومەتی

عێراق بە (هاوبەشی کورد و عەرەب لە عێراقدا. بەو هۆیەوە مەترسی هەڵگەڕانەوەی بارزانی لە حکومەتی قاسم جیاوازترە لە هەڵگەڕانەوەی دیکەی عێراق).(مەعاریف ،196/9/18، ل3).

لە درێژەی ئەم هەواڵانەی ڕۆژنامەکە لەسەر هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لە باشووری کوردستان بڵاویکردۆتەوە، لە ڕۆژی(٢٢ی ئەیلولی١٩٦١) تیشکی خستۆتە سەر جموجۆڵەکانی سوپای تورکیا لەسەر سنووری عێراق بەهۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد و لەم بارەیەوە نووسیویەتی:" دوێنی هێزەکانی تورکیا لەسەر سنووری عێراق کۆبوونەتەوە بەهۆی هەڵگەڕانەوەی کورد دژی ڕژێمی ژەنەراڵ قاسم. هەواڵەکە باس لەو دەکات کە ڕێبەری کورد مستەفا بارزانی، چۆتە ناو چیاکانی سنووری عێراق و ئێران. هاوکات بەپێی زانیارییەکانی ئەم ڕۆژنامەیە، فەرمانڕەوای عێراق، مولّک و سامانی (٨) کوردی دەست بەسەرداگرتووە لە بانقەکانی عێراق لەوانەی پشتگیری بارزانی دەکەن. سەرباری ڕاگەیاندنی دەستگیرکردنی(٣) چالاکوانی کورد لەبەیروتی پایتەختی لوبنان، کە بەنهێنی پەرینەتەوە ناو سنووری ئەم وڵاتە، بەئامانجی هاندانی کوردەکانی ئەم ناوچەیە، بۆ پشتگیریکردنی شۆڕشی کورد" (مەعاریف ،1961/9/22، ل2). دواتر لەبەردەوامی ڕاگەیاندنی دوا پێشهاتەکانی شەڕی نێوان شۆڕشگێرانی کورد و سوپای عێراقی، ڕۆژنامەکە باس لەوە دەکات کە لە دەرئەنجامی بەکارهێنانی هێزی ئاسمانی لەلایەن ژەنەراڵ قاسم، دەیان گوندی کوردی لەباکووری عێراق بە بۆردومانی فڕۆکە جەنگییەکانی عێراق وێرانکراون و دەیان هەزار کەس لە خەڵکی سڤیلی دانیشتوانەکانی ئەم گوندانە، بەهۆی بۆردومانەکانەوە کوژراون(مەعاریف ،1961/9/28، ل2) دوای ئەم ڕووداوە، پەیامنێری ڕۆژنامەکە لە لەندەنی پایتەختی بەریتانیا(ش. بن حاییم) لە بابەتێکدا بەناونیشانی( کوژرانی هەزاران کورد لە عێراق) کە لە ڕۆژی(١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٦١) بڵاویکردۆتەوە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەواڵی کوژرانی هەزاران کورد بەدەستی سوپای عێراقی، ئێمەی لە لەندەن نیگەران کرد، لە ئەنجامی بۆردوومانکردنیان لەلایەن هێزە ئاسمانییەکانی عێراق. پەیامنێرەکە بەسوود وەرگرتن لە زانیاریەکانی پەیامنیری ڕۆژنامەی (دەیلی تەلەگراف)ی لەندەنی لە بەیروتی پایتەختی لوبنان نووسیویەتی:" بەپێی زانیارییە ڕۆژنامەوانییەکان، ژەنەراڵ قاسم بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ خۆی سەرپەرشتی پرۆسە سەربازییەکان دەکات دژی کورد لەماوەی چەند مانگی ڕابردوو، هەڕەشەی لە کوردەکان کردووە لەناویان ببات، بەو هۆیەوە کوردەکان ڕووبەڕووی هێرشی ئاسمانی توند بوونەتەوە لەلایەن فڕۆکە جەنگییەکانی عێراقی و بۆردومانی تۆپ هاوێژەکان. لەو کاتەیدا کە هیچ زانیاری نییە لەسەر شوێنی ڕێبەری کورد مەلا مستەفا بارزانی، سوارچاکە کوردەکان شەڕێکی سەخت ئەنجام ئەدەن بەرامبەر سوپای عێراقی. لەگەڵ هاتنی وەرزی زستان پرۆسە سەربازییەکان لەم ناوچانە ڕادەوەستن، ئێستاکە لەزۆربەی ناوچە دوورە دەستەکان لە باکووری عێراق، ئالای کوردی هەڵکراوە" (مەعاریف ،1961/10/10، ل 1) .

بەپێی زانیارییەکانی پەیامنێری ڕۆژنامەکە (توهرو زمویب) لە لەندەن، سەرباری ئەم دۆخە ئاڵۆزەی کوردەکان ڕووبەڕووی بوونەوە لە قۆناغە سەرەتاییەکانی هەڵگیرسانی شۆڕشەکەیان، تەنها دوای تێپەڕبوونی چەند مانگێک، ئاڕاستەی شەڕەکە لەبەرژەوەندی شۆڕشگێرە کوردەکان شکایەوە، بەشێوەیەک وەک ئەم پەیامنێرە ئاماژەی پێکردوە بە پشت بەستن بەو زانیاریانەی لەبەیروتی پایتەختی لوبنان بەدەستی هێناوە، شۆڕشگێرە کوردەکان پانتاییەکی بەرفراوانی زەوییان بەدەستهێناوە، لە سنووری عێراق لەگەڵ تورکیا و سوریا و ئێران، بەشێوەیەک لەم ڕووبەرەدا بەنزیکەی (٥٠) ئاوەدانی کەوتۆتە دەستی هێزە کوردییەکان، سەرباری دەستبەسەرداگرتنی تەواوی ناوچەکانی (ئامێدی و زاخۆ و دهۆک). هەر بەپێی زانیارییەکانی ئەم سەرچاوەیە، ڕێبەری شۆڕشگێرە کوردەکان مەلا مستەفای بارزانی بارەگای خۆی لەم ناوچانەی کە دەستیان بەسەرداگرتووە دامەزراندووە و شوێنی خۆی جێگیر کردوە(مەعاریف ،12/31/ 1961، ل١).

لەگەڵ بەرفراوان بوونی بەرەی شەڕی شۆڕشگێرانی کورد لەگەڵ هێزەکانی سوپای عێراقی، ڕۆژنامەی (مەعاریف) گرنگی زیاتری بە ڕووداوەکانی شەڕ لە عێراق داوە. لەم سۆنگەوە یەکێک لە نووسەرەکانی ڕۆژنامەکە کە(دیڤید لانکشایر) بوو، لە ڕۆژی جەژنی سەری ساڵی ١٩٦٢، بابەتێکی بەناونیشانی (کاتێک شەڕی هەڵگەڕاوە کوردەکان دەستی پێکردەوە) بڵاوکردەوە و تیایدا نووسیویەتی:" شەڕی کوردەکان لەنێو بەفردا لە باکووری عێراق سەر لە نوێ دەستی پێکردەوە، دوای ئەوەی هۆزە کوردییەکان جارێکی دیکە دژی حکومەتی عێراقی ڕاپەڕین. بەم هۆیەوە حکومەتی عێراقی ڕێگری لە بڵاوبوونەوەی هەواڵەکانی شەڕ دەکات، تەنانەت گەشتکردنی بۆ باکووری عێراق قەدەغە کردووە. بەڵام هەندێک لە خەڵکی بەغدا، تا ڕادەیەک هەواڵی پچر پچری شەڕەکەیان پێدەگات، بەتایبەتی دوای ئەوەی ژمارەیەک لە کوژراوانی سەربازی عێراقی بوون، تەرمەکانیان گواسترایەوە بەغدا و لەگۆڕستانەکانی ئەو شارە بەخاک سپێردران، ئەوە سەرباری ئەو سەربازە بریندارانەی شەمەندەفەکان لە موسڵەوە لە کاتی بەیانیان دەیانگوازنەوە نەخۆشخانەکانی بەغدای پایتەخت. بەهۆیەوە هەندێک زانیاری بەدەست گەیشتووە کە تا ئێستاکە بە نزیکەی (٤٠٠) کوژراو و بریندار هەیە لەهەردوو لایەن. دیارە هەر بەپێی ئەو هەواڵانەی دەگەنە بەغدا، هەڵگەڕاوە کوردەکان لە بۆسەیەکدا (٣٩) سەربازییان

بەیەکجار کوشتووە. تەنانەت سەرچاوە نزیکەکانی شەڕ ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە یەکەی سەربازی سوپای عێراقی هەیە، تەنها یەک سەربازی لەژیاندا ماوە و ئەوانی دیکە بەگشتی کوژراون. زیاتر لەمەش هەڵگەڕاوەکان لە (١٨ی کانونی یەکەمی ١٩٦١) فڕۆکەیەکی جەنگی سوپای عێراقیان پێکاوە و خستویانەتە خوارەوە و فڕۆکەوانەکەشیان بەدیلی گرتووە، لە کاتێکدا ئەو فڕۆکەوانە خەریکی خستنەخوارەوەی بڵاوکراوەیەکی حکومەت بووە، کە تێیدا داوای لەهەڵگەڕاوەکان دەکرد خۆیان ڕادەستی حکومەت بکەن و بڕیاری لێخۆشبوونیان بۆ دەرکراوە (مەعاریف ،1/1/ 1962 ، ل2).

لەلایەکی دیکە، یەکێک لە نووسەرانی (مەعاریف) بەناوی ( دیمیز جاخینار) لە بابەتێکدا بەناونیشانی(هەڵگەڕانەوەی کورد، قاسم لەو کاتەی گەیشتۆتە سەر دەسەڵات دەخاتە نێو مەترسیدارترین قەیران) لە ژمارەی ڕۆژی(١٣ی ئایاری ١٩٦٢) نووسیویەتی:" فەرمانڕەوای عێراق ژەنەراڵ قاسم، ئێستاکە ڕووبەڕووی قەیرانێک بۆتەوە کە ڕەنگە مەترسیدارترین بێ لە ژیانی پیشەییدا، کە پڕبووە لە کێشە. بەپێی زانیاریی سەرچاوەی بێلایەن و نزیک لەدەسەڵات لەبەغدا، پێگەی جەماوەری قاسم ئەوەندە لاواز بووە، گەیشتۆتە ڕادەیەکی مەترسیدار، سەرباری بەگەرخستنی هەموو ئامرازەکانی پروپاگەندەی ڕۆژنامەگەری عێراقی. بەڵام لایەنی هەرە خراپ لە حوکمڕانی ئێستای قاسم، کێشەی بێ توانایی دەسەڵاتە لە زاڵبوون بەسەر هەڵگەڕانەوەی کورد لە عێراق. سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کوردەکان لە ئێستادا هەموو کوردستانیان لەژێر دەستدایە، سوپای عێراقی لە زۆربەی ناوچەکان بەزیوە و شکستی هێناوە لەپاراستنی ناوچەکانی، کە پێشتر لەژێر دەستیان دابوون. تەنها شارە گەورەکانی وەک (هەولێر و دهۆک و سلێمانی)یان لەبەردەست ماوە. سەرچاوەکانی نزیک لەبەرەکانی شەڕ ئاماژە بە کوژرانی نزیکەی(١٠) منداڵ دەکەن، بەهۆی بۆردومانی فڕۆکە جەنگییەکان بۆ سەر گوندە کوردییەکان. لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتیش، داخوازی هەڵگەڕاوە کوردەکان بۆ بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی زیاتر دەبێت. ئەوان داوای دامەزراندنی پۆلیسی سەربەخۆ و دانپێدانان بەزمانی کوردی دەکەن، وەکو زمانی فەرمی لەناوچە کوردییەکان و مەبەستیانە کاروباری کارگێری و تەندروستی لەژێر سەرپەرشتی خۆیاندابێ و گرنگی بە پەروەردە بدرێ لەناوچە کوردییەکان، سەرباری داوکاردنی پشکی کورد لە داهاتی نەوت(مەعاریف ،1962/5/13، ل3).

وەک دەرکەتووە بابەتەکانی ڕۆژنامەی(مەعاریف) و تارەکانی لەسەر دۆزی کورد هەمە چەشن بوونە، هەر ئەمەش وایکردووە سەرباری گواستنەوەی هەواڵ و بابەتەکانی پەیوەندیدار بوون بە ڕووداوەکانی شەڕ، بەڵام هاوکات بەبابەتی گرنگ و بایەخداری لەسەر هەڵویستی هەرێمایەتی بەرامبەر دۆزی کورد لە عێراق خستۆتەڕوو، تەنانەت بەپێی جۆری ئەو بابەتانەی بڵاویکردۆتەوە، هەندێکجار هەڵسەنگاندنی سیاسی بۆ دۆخەکە کردوە. لەم چوارچێوەیەدا، لە (٢٤ی ئەیلولی ١٩٦٢) یەکێک لە بابەتە هەستیار و پڕبایەخە سیاسییەکانی خۆی بەناونیشانی (تورکەکان لەسەر سنووری عێراق بەرامبەر هەڵگەڕاوەکانی بارزانی ڕووبەڕووی یەکتری وەستاون و مەترسیان دروستکردوە)، ڕۆژنامەکە نووسیویەتی:" لەم ڕۆژانە بەهۆی بەردەوام بوونی ئاڵۆزییەکانی باکووری عێراق، لە ئەنجامی هەڵگیرسانی هەڵگەڕانەوەی کورد دژی ڕژێمی قاسم لەبەغدا، تورکیا بێدەنگی هەڵبژاردووە و بەهەستیارییەوە مامەڵە لەگەڵ ڕووداوەکان دەکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دوو دڵییەکانی زیادی کردووە، لەئەنجامی ئەو پێشهاتە سیاسی و سەربازییانەی کە ڕووبەڕی (٢٣) هەزارکم٢ لە سنووری باکووری عێراق گرتۆتەوە. لە ئەنجامی گەشەسەندی شەڕ، کە ماوەی یەک ساڵە بەردەوامە. ئەمەش سنووری تورکیای لەگەڵ عێراق گۆڕیوە، بەشێوەیەک ئێستاکە (٣٠٠) کم٢، لەسنووری نێوان عێراق و تورکیا، لەژێر دەستی جەنگاوەرانی بارزانی دایە. دیارە تورکەکان هاوسۆزیان لەگەڵ هەڵگەڕاوە کوردەکان نییە لەبەر چەند هۆکارێک، یەکەمیان پەیوەندی هەیە بە دوو دڵیەکانی لە هەڵوێستی سیاسی مستەفا بارزانی. لەبەرئەوەی تورکیا پێی وایە بارزانی بەهۆی ئەوەی (١٢) ساڵان لە سۆڤیەت ژیاوە، دوای ئەوەی گەڕایەوە عێراق، یارمەتی لە سۆڤیەت وەرگرت بۆ دژایەتیکردنی حکومەتی عێراقی، بۆیە تورکەکان ناچار دەبن ئەمجارە بەئاشکرا بڵێن، بارزانی یارییەکی سۆڤیەتی دەکات، کە ڕەنگە ئەو ناوچەیە بکاتە مەڵبەندی خەباتی کۆمۆنیستی. ئەمەش هۆکاری سەرەکییە بۆ مەترسی تورکیا. ژمارەی فەرمی نییە سەبارەت بە ژمارەی دانیشتوانی کورد لە تورکیا. بەڵام نزیکە لە (٢-٦) ملیۆن کەس. بۆیە هەرچەندە کوردەکان لەپێناو بەدەستهێنانی ئازادی لە عێراق شەڕ دەکەن، بەڵام دەسەڵاتدارانی تورکیا گومانیان هەیە لەوەی ئەو داخوازییانە تەنیا هەنگاوی یەکەمیان بێت، ئەو کاتەی بارزانی ئۆتۆنۆمی بەدەستبێنێت هیچ گەرەنتییەک نییە بۆ ئەوەی هەوڵ بۆ بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی نەدات لەنێو ناوچە کوردییەکانی تورکیا و ئێران . لەکاتێکدا دەسەڵاتدارانی تورکیا ئاگادارن بە پەیوەندی بەهێزی بارزانی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە کوردانی تورکیا و تەنانەت لەسەرەتای هەڵگیرسانی شۆڕشەکەیدا، دەزگاکانی ئاسایشی تورکیا، تۆڕێکی نهێنی کوردییان دەستگیر کرد، کە خەریکی گواستنەوەی یارمەتی سەربازی بوون بۆ ناوچە کوردییەکانی ژێر دەسەڵاتی بارزانی لە عێراقدا. بەو هۆیەوە تورکەکان ئێستاکە ڕێکاری توندیان لەسەر سنوورەکان گرتۆتەبەر بۆ ڕێگریکردن لەم جۆرە پەیوەندییانە". لەدرێژەی باسەکەیدا ڕۆژنامەی (مەعاریف) نووسیویەتی:" نزیکەی(١٠) هەزار لە جەنگاوەرانی کورد شەڕی پارتیزانی زۆر سەرکەوتوو ئەنجام ئەدەن لەدژی سوپای عێراقی، ئەوان هێزێکن

ئەستەمە هیچ هێزێک بتوانێ بیانبەزێنێ، تەنانەت ئەگەر چەکی پێشکەوتوو و فڕۆکەش لە دژیان بەکاربێنێ. لەبەرئەوەی لە جوگرافیایەک شەڕ دەکەن، سروشتەکەی زۆر هاوکارییان دەکات و لە بەرژەوەندی ئەواندایە. ئێستا بارزانی دەسەڵاتی گرتووە بەسەر ناوچە نەوتییەکانی دەوروبەری موسڵ و بیر لەوە دەکاتەوە بیرە نەوتییەکان بتەقێنێتەوە. وای دەبینین کە هەڵگەڕانەوەی کورد یان بە رووخانی قاسم یان بە بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردەکانی عێراق کۆتایی بێت، بۆ کۆتایی هاتنی هەڵگەڕانەوەی کورد لە عێراقدا هیچ ئەگەرێکی دیکە نییە جگە لەم دوو بژاردەیە بۆ کۆتایی هاتنی هەڵگەڕانەوەی کورد لە عێراقدا (مەعاریف، ١٩٦٢/9/24،ل13).

ئەوەی ڕۆژنامەکە پێشبینی بۆ کردووە، وەک خۆی هاتەدی و ئەمەش لە هەواڵێکدا کە یەکێک لە پەیامنێرەکانی بەناوی (شموئیل سیجیف) بەناونیشانی (قاهیرە تووشی شۆک بوو بە کودەتای عێراق، کە هۆکارەکانی ڕوودانی دەگەڕێتەوە بۆ ناسەقامگیری بارودۆخی نێوخۆیی) لە (١٠ی شوباتی ١٩٦٣) خستەڕوو. لەو بابەتەدا ڕۆژنامەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، "کودەتای عێراق سروشتێکی جیاوازی هەیە لەگەڵ سەرجەم کودەتایەکانی دیکەی عەرەبی کە لە ماوەی (١٠) ساڵی ڕابردوو ئەنجام دراون. کودەتاچییەکان تەواوی دەستەی ئەرکانی سوپای عێراقیان دەستگیر کرد و دەستیان بەسەر بەغدای پایتەخت و چەند ناوچەیەک دیکەی عێراق داگرت و ئەنجومەنێکی سەرکردایەتی شۆڕشیان لە (٦) کەس پێکهێنا و عەبدولسەلام عارفیان بەسەرۆکی نوێی عێراق دامەزراند و دەستیانکرد بە پێکهێنانی حکومەتێکی نوێ کە لە ( ٢١) وەزیر. لەم ڕێژەیەش (٣) لە وەزیرەکان لەلایەنگرانی جەماڵ عەبدوڵناسر و (٢) یان کوردن. وەک دەرکەتووە ئەم هەنگاوە بەو ئاڕاستەیە خۆی دەنوێنێ، کە حکومەتی نوێی عێراق ئامانجی ئاشتەوایی هەیە لەگەڵ هۆزە کوردییە هەڵگەڕاوەکان"( مەعاریف ، 1963/ 2/10، ل2) .

**١- ٣/ پەیوەندییەکانی کورد و حکومەتی عێراق (٨ی شوباتی ١٩٦٣- ١٧ تەمموزی ١٩٦٨) لە ڕۆژنامەی مەعاریفدا:**

هەستیاری و ئاڵۆزییەکانی ناوچەکە کاریگەریی هەبووە کە ڕۆژنامەکە بەردەوام بێت، لە بەدواداچوون بۆ بڵاوکردنەوەی بابەتەکانی پەیوەست بە دۆزی کورد، بەڵگەی ئەمەش بەپێی زانیارییەکانی پەیامنێری ڕۆژنامەی مەعاریف(شموئیل سیجیف)، لەدەستپێکی بەدەستهێنانی دەسەڵات، حکومەتی عەبدوالسلام عارف( ١٩٦٣- ١٩٦٨) ڕووبەڕووی دوو کێشەی سەرەکی بۆتەوە، یەکەمیان دۆزی کوردە لە عێراق و ئەوەی دیکەیان پرسی چارەنووسی (کوەیت)ە. سەبارەت بە دۆزی کورد، حکومەتی عێراق ئاماژە بەوە کردووە خەریکە یەکەم هەنگاوی کردارەکی دەنێ بۆ چارەسەرکردنی پرسی کورد و تەنانەت دوو وەزیری کوردی لە حکومەتەکەی بەشداری پێکردووە، بەڵام زەحمەتە هیچ شاندێکی عێراقی، بتوانێ ڕەزامەندی دەربڕێ لەسەر داخوازی و داواکارییەکانی سەرکردایەتی سیاسی کورد لەم قۆناغەدا، بەشێوەیەک چارەسەرێک بۆ ئەو پرسە بدۆزنەوە، هەردوو لایەن پێی ڕازی بێت(مەعاریف، 1963/2/13، ل2).

لەلایەکی دیکە ڕۆژنامەی(مەعاریف) لە چوارچێوەی گرنگیدانی بە دۆزی کورد، لە هەندێ کاتدا کاری وەرگێڕانی بۆ بەشێک لەو بابەتە گرنگ و هەستیارانە کردووە، کە لەڕۆژنامە جیهانییەکان بڵاودەکرانەوە، لە زمانی دیکەوە بۆ سەر زمانی عیبری و لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکە بڵاویدەکردنەوە. بۆ نموونەش نووسەری ئینگلیزی(ئیریک داونتاون) ئەو کاتەی بابەتێکی لە ڕۆژنامەی (دەیلی تەلەگراف)ی ئینگلیزی بەناونیشانی (مۆسکۆ هانی کوردەکان دەدات دژی عارف هەڵبگەڕێنەوە)، ڕۆژنامەکە دەقەکەی وەک خۆی بڵاوکردۆتەوە بە زمانی عیبری، کە تیایدا هاتووە:" بانگەشە و پروپاگەندەکانی سۆڤیەت، هانی کوردەکان دەدات لە باکووری عێراق، شۆڕش لە دژی حکومەتی کودەتاچی دوژاوی عارف بکەن. ئەم بەرنامانەی لە ئێستگەی مۆسکۆ پەخش دەکرێن سەبارەت بەو بابەتە، تۆڵەسەندنەوەی مۆسکۆیە لەدەسەڵاتدارانی نوێی عێراق بەهۆی ئەو کۆمەڵکوژییەی دژی شیوعییەکان ئەنجامی ئەدەن لە وڵاتەکەدا. بەڵام کوردەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە ئەگەری ڕێککەوتنی ئاشتی لەگەڵ دەسەڵاتی نوێی عیراق لەئارادایە و ئێستاش پەیوەندی هەیە لە نێوان ئەنجومەنی کودەتاچییەکانی بەغدا و نوێنەرانی کوردە هەڵگەڕاوەکان(مەعاریف ،1963/,2/15،ل١).

هەر لە نێو باسی گفتوگۆ و دانوستان لەنێوان سەرکردایەتی کورد و حکومەتی تازە دامەزراوی عێراق لەبەغدا، ڕۆژنامەی (مەعاریف)، لەڕۆژی (٢١ی شوباتی ١٩٦٣) بە پشت بەستن بەزانیارییەکانی وتەبێژی حکومەتی عێراقی ڕایگەیاند، کە ئێستاکە (٢) نوێنەری کورد لە بەغدای پایتەختن لە پێناو دانوستاندن بۆ ڕێگریکردن لە هەڵگیرسانەوەی شەڕ(مەعاریف،1963/2/21،ل1). تەنانەت لە چوارچێوەی ئەم بابەتانەی بەزمانی ئینگلیزی وەریگێردراونەتە سەر زمانی عیبری لە بابەتێکی دیکەدا کە بەهەمان شێوە لە ڕۆژنامەی (دەیلی تەلەگراف)ی بریتانی وەریگرتوە، ڕۆژنامەکە لە (٢٠ی ئایاری ١٩٦٣) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کەبەهۆی بەرێکنەکەوتن لەنێوان کورد و حکومەتی عێراقی، ئەوەی دوایی لەڕێگای ئامادەکردنی سێ بەشی سوپای عێراقی، چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرێ هێرش بکاتە سەر کوردەکان. لەدرێژەی بابەتەکە ڕۆژنامەکە نووسیویەتی:" حکومەتی عێراقی هێزەکانی خۆی جوولە پێکردووە بۆ باکووری عێراق، لە ئەگەری شکستهێنانی دانوستانەکان، کە وەک ڕۆژنامەی (دەیلی تەلەگراف) ئاماژەی پێکردووە چاوەڕوانی گەڕانەوەی جەلال تاڵەبانی دەکەن لە گەشتەکەیدا بۆ لای جەمال عەبدولناسر کە ئەو کات لە قاهیرە بووە، بۆ

خستنەڕووی داخوازییەکای کورد بۆ ئۆتۆنۆمی و بە ئامانجی بەدەستهێنانی پشتگیری ناسر. بەڵام سەرباری ئەم دۆخە بەپێی زانیارییەکانی یەکێک لە ئەندامانی دانوستکاری کورد کە ناوی (ساڵح عەبدوڵلا یوسفی١٩١٨-١٩٨١)یە و بۆ ڕۆژنامە بەریتانییەکان قسەی کردووە، ئەگەر دانوستانەکان لەم هەفتەیە نەگەنە ئەنجام، کاتێک شەڕ دەستپێدەکاتەوە، کورد تێیدا سوودمەند نابێت. بەگوتەی ڕۆژنامەکە یوسفی باوەڕی وابووە :" (لە ئەو کاتدا حکومەتی عێراقی ژمارەیەکی زۆری هێزەکانی گواستۆتەوە بۆ باکوور، هاوشێوەی ئەو ڕۆژانەی لەشەڕ دابوو لەدژی کوردەکان لەسەردەمی قاسم. تەنانەت هێزەکان ئاڵوگۆڕیان پێکراوە و تانک و زریپۆشی زیاتری گواستۆتەوە ناوچەکە. هێزەکانی عێراقی مەزەندە دەکرێن بە (٣) تیپی سەربازی پیادە کە خۆیان لە نزیکەی (٤٥) هەزار سەرباز دەبن) . هاوکات هەر لەم بارەوە دەڵێت :" ساڵح یوسفی ئاماژەی بەوە داوە (حکومەتی عارف بەڵێنەکەی خۆی جێبەجێ نەکردووە سەبارەت بە ئازادکردنی (٤٥٠) گیراوی سیاسی کورد کە زۆربەیان قوتابی و ئافرەتن. کە پێشتر لەلایەن قاسم وەک بارمتە لە کونجێکی بەندیخانەکان دانرابوون(مەعاریف،١٩٦٣/5/20، ل2).

بەردەوامی ئاڵۆزییەکان وایکردووە دوای تێپەڕبوونی سێ هەفتە، ڕۆژنامەکە جارێکی دیکە لەبارەی پرۆسە سەربازییەکانی لەلایەن حکومەتی عێراقی لە ڕاگەیاندراوێکدا ئامارێکی زیانەکانی هێزە کوردییەکانی بلاوبکاتەوە، بە پشت بەستن بەزانیارییەکانی ئێستگەی بەغدا کە تیایدا هات:" (٤٥) هەزار سەربازی عێراقی هێرشیان کردۆتە سەر گوندە کوردییەکان. لەو هێرشەدا سوپای عێراقی وێرانکاری لەناوچە کوردییەکان ئەنجام داوە و بەو هۆیەوە خەڵکی ئەم ناوچانە لەسەر زێدی خۆیان دەرچوون و ڕوویان کردۆتە ناو شاخەکان. لەشەڕەکاندا هێزە کوردییەکان زیانی گیانی زۆریان پێگەیشتووە، وەک ڕۆژنامەکە باسی دەکات تەنیا لە شەوی (١٣ی حوزەیرانی ١٩٦٣)، هێزە کوردییەکان(١٦٥) کوژراویان هەبووە و (٣٠) دیکەیان برینداربوون. سەرباری ئەوەی سوپای عێراقی توانیویەتی بچێتە ناو (١٠) گوند لە دەوروبەری شاری دهۆک، کە پێشتر لەدەست هێزە کوردییەکان بوون(مەعاریف،1963/6/14، ل1).

لەگەڵ فراوان بوونی بەرەی شەڕی کورد و حکومەتی عێراقی، وڵاتانی دراوسێی عێراق، بەتایبەتی دەسەڵاتدارانی ئەنقەرە، مەترسیان هەبوو لە لێکەوتەکانی ئەم شۆڕشە، لەبەرئەوەی بارزانی لە پەیوەندی بەهێزدابوو لەگەڵ کوردانی باکووری کوردستان. بەم هۆیەوە وەک ڕۆژنامەی (مەعاریف) لە هەواڵێکدا کە لە (٣٠ی حوزەیرانی ١٩٦٣) بڵاویکردۆتەوە بەناونیشانی (سوپای تورکیا جولەی پێکراوە بۆ سەر سنووری عێراق)، ڕۆژنامەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە حکومەتی تورکیا ڕێکاری توندی خۆپارێزی لەسەر سنوورەکانی بەدرێژایی (٢٥٠) کم٢ لەگەڵ عێراق گرتۆتەبەر، بەمەبستی ڕێگریکردن لە گواستنەوەی یارمەتی و هاوکاری کوردانی دانیشتووی وڵاتەکەی بۆ جەنگاوەرانی مەلا مستەفا بارزانی، بەتایبەتی دوای ئەوەی دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەم وڵاتە، ئاماژەیان هەبوو لەسەر ئەوەی کوردەکانی دانیشتووانی ناوچە نزیکەکانی سنووری عێراق بوون ، لە پێشتر هاوکاری و کۆمەکی هێزەکانی بارزانیان کردووە لە ڕووی سەربازییەوە. حکومەتی ئەنقەرە بەهۆی مەترسی و نیگەرانییەکانی لەم دۆخە، پێشوازی لە پرۆسە سەربازییەکانی سوپای عیراقی کردووە کە دژی هێزەکانی بارزانی ئەنجامی ئەدات و ئامادەیی دەربڕیوە بۆ هاوکاریکردنی حکومەتی عێراقی لە پاراستنی سنوورەکانی بۆ ڕێگریکردن لە پەڕینەوەی کوردەکانی عێراق بۆ ناو خاکی تورکیا(مەعاریف ، 1963/6/30، ل 3).

دیارە یەکێک لە ئامانجەکانی ڕۆژنامەی (مەعاریف) بۆ تێگەیشتن لە سروشتی شۆڕشی کوردی، هەوڵدان بووە بۆ نزیکبوونەوە لە کەسایەتی بارزانی و ناساندی ڕێبەری کورد بە خوێنەرەکانی، لەم سۆنگەوە لەدوای پەرەسەندی شۆڕشی کورد و ئەنجامدانی پرۆسە سەربازییەکانی سوپای عێراقی لەناوچە جیاوازەکانی باشووری کوردستان، یەکێک لە پەیامنێرانی ڕۆژنامەکە کە ناوی( تسفی لاڤی) یە، خۆی گەیاندۆتە یەکێک لە هاوڕێ دێرینەکانی مەلا مستەفا بارزانی کە پێشتر ئەو کاتەی لە عێراق ژیاوە، دۆستایەتی نزیکی لەگەڵ بارزانیدا هەبووە و بابەتێکی بڵاوکردۆتەوە بەناونیشانی ( ئەندامانی خێزانی دێڤید گابای باس لە پەیوەندی کۆنیان دەکەن لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی). نووسەری ئەم بابەتە لە نیوەڕۆکی باسەکەیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە:" هەڵگەڕانەوەی کورد لەعێراق، کاریگەریی لەسەر یەهودییەکی کوردستان هەیە کە ئەمیش (دێڤید گابا)یە. ئەو پیاوەی لەگەڵ خێزانەکەی لە شاری (تەبریا) دەژێت و لەدیمانەیەکدا لەگەڵ ڕۆژنامەکە باسی لەوە کرد، کە هەر کاتێک ئەو لەئێستگەی بەغدا گوێبیستی ئەوە دەبێت کە هەڵگەڕانەوەی کورد سەرکوتکراوە و مەلا مستەفا کوژراوە، دۆخی وەک ئەوە وایە لەسەر ئاگر دانیشتبێ و هیچ ئۆقرەی نامێنێ. لەبەرئەوەی مەلا مستەفا چاکەی زۆری بەسەر جوولەکەکانی کوردستانی عێراق هەیە. بۆچی حکومەتی ئیسرائیل هاوکاری و یارمەتی ئەفریقییەکان دەدات، بەڵام یارمەتی گەلێکی بێ پشتیوان و نادات. وەک گابای دەڵێت:" ئەگەر دەرفەت هەبێ، ئێمە هەموو موڵک و ماڵ و ڕۆحمان دەبەخشینە بارزانی"( مەعاریف ،1963/7/5، ل13).

به پێی هەواڵەکانی ڕۆژنامەی مەعاریف لە ئەنجامی پەرەسەندنی شەڕ لە باشووری کوردستان، بەهۆی پرۆسە سەربازییەکانی سوپای عێراقی، (١٢٠٠) پەناهەندەی کوردی ناوچە جیاوازەکانی شەڕ، ڕوویان کردۆتە ناوچەی هەکاری لە باکووری کوردستان و لەلایەن کوردانی نیشتەجێی ئەم ناوچەیە، بەگەرمی پێشوازی لێیان کراوە(مەعاریف ، 1963/9/3، ل1).

لەلایەکی دیکە پەرەسەندنی شەڕ و ئەنجامدانی کۆمەڵکوژی لەلایەن سوپای عێراقی بەرامبەر دانیشتووانە کوردەکانی کەوتبوونە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی هێزە کوردییەکانی لایەنگیری مەلا مستەفا بارزانی، دەنگدانەوەی نێودەوڵەتی هەبوو، بەو هۆیەوە بەپێی زانیارییەکانی ڕۆژنامەی(مەعاریف)ی ئیسرائیلی، حکومەتی مەنگۆلیا لەسەرەتاکانی مانگی ئایار یاداشتێکی پێشکەشی سکرتێری کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد بۆ ئەوەی پرسی کۆمەڵکوژیکردنی کورد لەلایەن حکومەتی عێراقی بخاتە کارنامەی دانیشتنی داهاتووی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە بڕیار بوو لەمانگی تەمموز ئەنجام بدرێ، بەڵام لەگەڵ دەستپێکی کردنەوەی دانیشتنەکانی خولی (٧٥)ی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان، وەزارەتی دەرەوەی (مەنگۆلیا) داواکارییەکەی خۆی کشاندەوە، بەهۆی پشتگیرینەکردنی لەلایەن ولاتانی (ئەفریقیای و ئاسیاوی)، بەڵام ئەم دۆخە نەبووە هۆی ئەوەی حکومەتی مەنگۆلیا دەستبەرداری پشتگیریکردنی دۆزی گەلی کوردبێ، بەڵکو وەک ڕۆژنامەی (مەعاریف) بڵاویکردۆتەوە، وەزیری دەرەوەی مەنگۆلیا لە کۆبوونەوەی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان، لە (١ی تشرینی یەکەمی١٩٦٣)، وتەیەکی پێشکەشی ئامادەبووان کرد و تیایدا ئاماژەی بۆ ئەوە کرد و ڕایگەیاند کە:" عێراق کۆمەڵکوژی دژی کوردەکان ئەنجام داوە، حکومەتەکەشی سەرباری کێشانەوەی داواکارییەکەی، بەڵام دەستبەرداری مافی وڵاتەکەی نابێ بۆ گەڕانەوە بۆ سەر ئەم پرسە، ئەگەر بارودۆخەکە پێویست بکات". ئەم ڕاگەیەنراوەش شاندی عیراقی نیگەران و نارەحەتکرد و بۆیە نوێنەری هەمیشەیی عیراق لە کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان، حکومەتی مەنگۆلیای تۆمەتبارکرد بەدەست وەردان لە کاروباری ناوەخۆی وڵاتەکەی(مەعاریف، 1963/10/2، ل2).

دۆخی شەڕ لەگەڵ هاتنی ساڵی نوێی ١٩٦٤ گۆڕانی ئەرێنی بەسەرداهات، دوای ئەوەی بەپێی ڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەی (مەعاریف) لە هەفتەی دووەمی مانگی شوباتی ١٩٦٤، لە ئەنجامی نێوەندگیری میسر و سۆڤیەت، سەرۆکی عێراق (عەبدولسەلام عارف) ڕایگەیاند کە:" بۆ ڕەخساندنی کەشێکی ئارام بۆ گفتوگۆ و دانوستاندن لەسەر بەخشینی ئۆتۆنۆمی بە کورد لەگەڵ سەرکردایەتی کورد، ئاگربەستی شەڕی لەناوچەکانی باکووری عیراق جێبەجێ دەکەن. لەم ڕاگەیەنراوە سەرۆکی عێراق بەڵێنیدا بە ئازادکردنی گیراوە سیاسییەکانی کورد و ئاوەدانکردنەوەی کوردستان. لەسەر ئەم بنەمایە هەر بەپێی زایارییەکانی ئەم ڕۆژنامەیە، مەلا مستەفا بارزانی لەلای خۆیەوە ئاگربەستی ڕاگەیاند و بڕیایدا بچێتە ناو دانوستاندن لەگەڵ حکومەتی عێراقی، بۆ بەدەستهێنانی داواکارییەکانی گەلی کورد(مەعاریف ، 1964/2/14، ل3).

سەبارەت بە هەڵوێستی سۆڤیەت بەرامبەر دۆزی کورد، ڕۆژنامەی مەعاریف، لەڕێگای بابەتێکی ڕۆژنامەنووس و پەیامنێری ڕۆژنامەی(براڤدا) کە ناوی (یەڤگینی بریماکۆف)ە، باس لە دوو دڵیەکانی ئەم وڵاتە دەکات لە دەستپێکردنەوەی شەڕ لە نێوان کورد و حکومەتی عێراقی، لەبەرئەوەی بە بڕوای سۆڤیەت حکومەتی عێراقی بۆ زاڵبوون بەسەر بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی، سەرباری ئەوەی هەوڵی نزیکبوونەوەی زیاتر لەبەرەی وڵاتانی ڕۆژئاوا، کار دەکات بۆ خۆنزیکردنەوە لە وڵاتانی دراوسێی وەک تورکیا و ئێران. دیارە ئەمەش بەلای دەسەڵاتدارانی مۆسکۆ دۆخێکی مەترسیدار لەناوچەکە دروست دەکات، لەکاتێکدا حکومەتی عێراقی هەموو ئامرازێک بۆ لەناوبردنی شیوعی و کوردەکان بەکاردەهێنی. بۆیە لە ڕێگای ئەم ڕۆژنامەیەوە ، مۆسکۆ داوای لە بەغدا دەکات، بەڵێنەکانی خۆیان بەرامبەر گەلی کورد جێبەجێ بکەن و مافەکانیان بدەن(مەعاریف ، 1965/2/5، ل10).

هەوڵەکانی ئاشتەوایی و ڕێککەوتن لەنێوان کورد و حکومەتی عێراقی گەیشتە بن بەست. بەو هۆیەوە وەک ڕۆژنامەی (مەعاریف) لە ڕۆژی (١٤ی ئاداری ١٩٦٥) بڵاویکردۆتەوە، حکومەتی عێراقی بە بەشداری (٤٠) هەزار سەرباز، ئامادەسازی دەکات بۆ هێرشکردنە سەر ناوچە کوردییەکانی باکووری عێراق. بەپێی زانیارییەکانی ئەم ڕۆژنامەیە، ئۆپراسیۆنە سەربازییەکانی سوپای عێراقی لە کۆتایی مانگی ئادار یان سەرەتای مانگی نیسان ئەنجام ئەدرێ. وەک ڕۆژنامەکە باسی دەکات، ئاژانسەکانی هەواڵی ئیسرائیلی، هەواڵیان پێگەیشتووە کە (عیسمەت شەریف وانلی١٩٢٤-٢٠١١) نوێنەری ڕێبەری کورد مەلا مستەفا بارزانی، ئێستا سەردانی پاریس دەکات و چەند نامەیەکی بارزانی پێیە و مەبەستیەتی بیگەیەنێ بە هەریەک لە سەرۆکەکانی ئەمریکا و فەرەنسا و میسر و هیند(مەعاریف ، 1965/3/14، ل 2).

ڕۆژنامەکە ئاماژە بە بەردەوام بوونی هەردوو حکومەتی میسری و سوڤیەتی لەسەر فشار دروستکردن لەسەر حکومەتی عێراقیبۆ چارەسەرکردنی پرسی کورد بەشێوەیەکی ئاشتیخوازانە. بەتایبەتی دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵی خۆئامادەکردنی سوپای عێراقی بۆ هێرشکردنە سەر کوردستان لە مانگی نیسانی ١٩٦٥، لەئەنجامی ئەو ناکۆکی و ململانێیانەی لەنێو سەرکردایەتی شۆڕشی کورد دروست بوو لەساڵی ١٩٦٤ بەهۆی جیابوونەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی لە ڕیزی شۆڕشگێرانی کورد، بووە جێگەی بایەخ و گرنگیدانی زیاتری

ڕۆژنـامەكە، بەبـارودۆخی باشـووری كوردسـتان و پەیوەنـدییەكانی سـەركردایەتی كـورد لە گەڵ حكـومەتی عێراقی. لەم سـۆنگەوە ڕۆژنامەكە بابەتێكی بەناونیشـانی ( لەئەنجـامی ململانێیەكـانی نێـوان سـەركردایەتی كـوردی، حـوكمڕانی عێـراق وای دەبینێ كـاتەكە گونجاوە بۆ دەستپێكردنی پرۆسەیەكی سەربازی نوێ و كۆكردنەوەی (٤٠) هەزار سەرباز بۆ سەركوتكردنی بەرگـری كـورد). ڕۆژنـامەكە نووسیویەتی:" ئاماژەكان ڕووداوی تەقینەوەیەكی نوێ لەناوچە كوردییەكان بەدیاردەخەن. سەربازە عێراقییەكـان ئامادەسـازی دەكەن لە باكووری وڵات و دەڵێن ئێمە بۆ هێرشكردن دەچین و ئامانجیان دەستبەسەرداگرتنی ناوچە كوردییەكانە لە وڵاتەكەیانـدا .نـزیكەی یەک ملیۆن كورد لە عێـراق دەژیـن. لەسـاڵی ١٩٦١ وەوە لە پێنـاو دامەزرانـدنی نـاوچەیەكی ئۆتۆنـۆمی شـەڕ دەكەن. لەسـاڵی ڕابـردوو هەردوو لایەنـی حكـومەتی عیراقـی و سـەركردایەتی كـورد، ڕێككەوتنـی ئاگربەسـتیان واژۆ كـرد.دوای ئەوەی هەمـوو هەوڵەكـانی حكومەتی عێراقی بۆ دەركردنی شۆڕشگێرە كوردەكان لە ناوچەكانی تێدابوون شكستی هێنا لە پێشـتر لەبەرئەوەی ڕێكەوتنـی كـورد و حكومەتی عێراقی ساڵی ١٩٦٤ پاڵپشتی جەماوەری بەدەست نەهێناوە. ئەم دۆخە كاریگەری زۆری لەسەر ڕێبەری كـورد مەلا مسـتەفا بارزانی هەیە. بەڵێ ڕەنگە دانوستانەكان كۆتاییان بێت. لەبەرئەوەی حكومەتی عێراق هەست دەكـات توانـا سـەربازییەكانی لە پێشـتر بەرزترە و توانای شەڕكردنی هێزە كوردییەكان لاوازە. ئێستاكە سوپای عیراقـی ئامـادەیە بـۆ هێرشـكردنە سـەر كوردەكـان لەبەرئەوەی چەنـدین فڕۆكەوانـی ئامـادەكردووە كە لە(میسرـ) مەشـق و ڕاهێنانیـان پێكـراوە و چەک و تەقەمەنـی زۆری سـۆڤیەتیان بەدەسـت گەیشتووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەردوو لایەنی (مۆسكۆ) و (قاهیرە)، داوا لە عارف دەكەن، زیاتر بیر بكاتەوە، بەر لەوەی هێـرش بكاتە سەر كوردەكان. كوردەكان بارودۆخی ئاڵۆزی نێوخۆیی شۆڕشی كورد لە گەلەكەیان ناشارنەوە، بەڵام پێیان وایە(عـارف) هەڵەیە لەوە وا تێبگات كە ئەوان بەهۆی ئەو ململانێیەی ناو پارتەكەیان، یەكگرتوونین. بەو هۆیەوە دەتوانێ هێرشێكی لەناكاوی كتوپڕ بكـات و لەناویان ببـات. ژەنەراڵ (تاڵەبـانی) ئامـاژە بـۆ ئەوە دەكـات، كە سـوپای كـوردی پارێزگـاری لە هێـزەكەی خـۆی كـردووە و توانـای خۆڕاگری و بەرگری هەیە لەبەرامبەر هەر ئاراستەیەكی نوێی شەڕ(مەعاریف ، 1965/4/12، ل21).

هەر سەبارەت بە ئەگەری هەڵگیرسانەوەی شەڕ، بەپێی زانیارییەكانی ڕۆژنـامەی (مەعـاریف)، شـەوكەت عەقـراوی نـوێنەری كـورد، لە(١٩ی نیسانی ١٩٦٥)لە قاهیرە بانگەوازی كردووە بۆ سەرۆكی میسر و تەواوی حكومەتە ئاشـتیخوازەكانی جیهـان و تیایـدا دەڵێـت:" بەشیوەیەكی ئاشتیخوازانە داوا لەهەموو ولاتان دەكەین داوا لە حكومەتی عێراق بكەن، بۆ ئەنجام نەدانی پرۆسـەی سـەربازی دژی گەلی كورد"( مەعاریف 1965,/4/20، ل2).

لە بابەتێكی دیـكەی هاوشـێوەدا، ڕۆژنـامەكە بەناونیشـانی ( كوردەكـان داوای دانوسـتاندن دەكەن بـۆ دۆزینـەوەی چارەسـەرێک بە ڕێگایەكی ئاشتیخوازانە بۆ پرسی كورد)، ڕۆژنامەكە لە (٢٢ی نیسـانی ١٩٦٥) نووسـیویەتی:" هەڵگەڕاوەكـانی بـاكووری عێـراق، داوای ڕێككەوتـن دەكەن بـۆ چارەسـەركردنی دۆزی كـورد بە ڕێكـاری ئاشـتیخوازانە. ئەمەش ڕێكخراوێـک لە بەیـروت ئەم ڕاگەیەنـراوەی بڵاوكردۆتەوە كە لایەنگیری مەلا مستەفا بارزانییە. لە ڕاگەیەنراوەكەدا هـاتووە سـوپای عێـراق ئامادەسـازی دەكـات بـۆ ئەنجامـدانی پرۆسە سەربازییەكان دژی كورد . ئەم هێرشە چاوەڕوانكراوە لە ماوەی (١٠) ڕۆژی دیكە ئەنجـام بـدرێ. ژێـدەرەک ئامـاژەی بـۆ ئەوە كردوە كە پێكدادانێكی سەربازی گەورە لە نزیک سلێمانی ڕوویـداوە لەنیـوان سـوپای عێراقـی و هێـزە كوردییەكـان لە نیسـانی ١٩٦٥. بەگوێرە ئامارە سەرەتاییەكان، ژمارەی كوژراوانی سوپای عێراقی (٩) كەس بووە لەم شەڕەدا(مەعاریف ، 1965/4/22، ل2).

لە هەواڵێكی دیكەی ڕۆژنامەكە، هەر سەبارەت بە هەڵگیرسانەوەی شەڕی نێوان حكـومەتی عێـراق و هێزەكـانی كـورد، ڕۆژنـامەكە ئاماژە بـۆ ئەوە دەكـات كە سـوپای عێراقـی زیـانی گەورە پێگەیشـتووە و ئەم زیـانە زۆرانەش بـووەتە هـۆی سـەرهەڵدانی نـارەزایی جەماوەری زۆر لە شەقامی عێراقی دژی سەرۆک عارف. بەپێی هەواڵی ڕۆژنامەكە حكومەتەكەی عارف ڕووبەڕووی قەیـران بـۆتەوە، نەخۆشخانەكانی بەغدا پڕ بوون لە سەربازە بریندارەكانی شەڕی باكوور. لە شەقام و قاوەخانەكـان، خەڵـک بەئاشـكرا قسـە لەسـەر نزیكبـوونەوەی ڕووخـانی حكـومەت دەكـات. ئێسـتاكە (١٠٠) هەزار سـەربازی عێراقـی لە بـاكوور كۆبـوونەتەوە. شـەڕ لە هەمـوو پارێزگایەكانی باكووردایە. عێراقییەكان تـا ئێسـتا، بەلایەنـی كەم ، ڕووبەرووی (٣) شكسـتی مەترسـیدار بـوونەتەوە. كوژراوەكـانی لە پلەی ئەفسەر نزمترن، هەر لە ناوچەكانی باكوور بەخاک سپێردراون. بەڵام تەرمـی هەنـدێک لە ئەفسـەرەكان ڕادەسـتی مالەكانیـان كراونەتەوە لە باشوور بۆئەوەی بەخاكیان بسپێرن. بریندارەكان بە شەمەندەفەر و فڕۆكە دەگوازرێنەوە بەغـدا. هێـزە ئاسـمانییەكان بۆردومانی گوندە كوردییەكـان دەكەن لە دەوروبەری هەولێـر و سـوپا دوو گونـدی كـوردی و گونـدێكی كریسـتیانەكانی بەتەواوەتـی وێران كردووە. سەربازە كوردەكـان كە ژمارەیـان نـزیكەی (١٠) هەزار جەنگـاوەرە، شـیوازی شـەڕی شـاخاوی پـارتیزانی پیـادە دەكەن. دەگەڕێنەوە ناو چیاكان بەر لەوەی سوپای عێراقی دەست بە هیرش بكات، كاتێـک سـەربازانی عێراقـی دەچـنە پیشـەوە، هەموویـان ئابلوقەدەدەن و یان شەوان هێرشی كتوپڕیان دەكەنە سەر. یەكەیەكی سوپای عێراقی لەسەر ڕێگای (كەركووک- هەولێر) كەوتۆتە ناو بۆسەیەكی جەنگاوەرانی كـورد و زیـانی زۆریـان پیگەیشـتووە ...ئەە وەی جیـگەی سـەرنجە لە درێـژەی ئەم هەواڵەدا كە ڕۆژنـامەكە

ئاماژەی پیکردوە، نارەزایی خەڵکی عێراقە لەو موچەی حکومەتی عێراقی بە (١٠٠٠) سەربازی میسری دەدات کە لەعێراق بوون. هەروەها پێدانی موچە بە کرێکارو ڕوایژکارە میسرییەکان کە ژمارەیان (١٢٠٠٠) کەس دەبێت لەوانەی لە عێراق نیشتەجێن. هەموو ئەو ئاماژانە هانی نیشتمانپەروەرانی عێراق دەدات، جوولە بکەن لە دژی حکومەتی عارف (مەعاریف ، 1965/5/3، ل2).

ریتچارد تشیبتون ڕۆژنامەنووس لە ڕۆژنامەی (دەیلی تەلەگراف)ی ئینگلیزی بابەتێکی بەناونیشانی (سەرۆک عارف و سەرۆک وەزیران پشتگیری لە دۆزینەوەی چارەسەر دەکەن") بلاوکردەوە و لە ڕۆژی (١٩ی نیسانی ١٩٦٦) دوای هەڵبژاردنی عەبدولڕەحمان عارف بەسەرۆکی نوێی عێراق بە چەند ڕۆژێک، بابەتەکە وەک خۆی وەرگێردرایە سەر زمانی عیبری و لەڕۆژنامەی (مەعاریف) بڵاوکرایەوە. لەمڕ باسەدا ئەوەی ئاماژەی بۆ کراوە، کەگوایە سەرۆکی نوێی عێراق ژنەڕاڵ عارف، ڕووبەڕووی ململانێیەکی توند بۆتەوە. لەلایەک دابەشبوونی قوڵی فەرماندە باڵاکانی سوپا بەهۆی شەڕ لەبەرامبەر کورد. وە دوو دڵی زۆری فەرماندە بالاکانی سوپا لە بەشداریکردن لە پرۆسە سەربازییەکان لە باکووری عێراق. سەرۆکایەتی عێراق دوای مردنی عەبدولسەلامر عارف لە هەفتەی ڕابردوو، مکوڕە لەسەر بیروڕای خۆی لەسەر پێویستی بەکارهێنانی هەموو تیپەکانی سوپای عێراقی لە هێرشکردنی گشتگیر لە دژی کوردەکان. ئەمەش بووە هۆی درستبوونی دابەشبوون لەنێو سوپا و ئەوانەی هاوکاربوون بۆ هەڵبژاردنی عارف بەسەرۆکی عێراق. بەڵام لەبەرئەوەی سەرۆک وەزیرانی عێراق عەبدولڕەحمان بەزاز بڕاردەی سەربازی لەدژی کورد ڕەت دەکاتەوە و لەگەڵ نیە، ئێستاکە دەرفەتێکی لاواز هەیە بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد. دوای ئەوەی بەهۆی ڕووداوی مردنی عەبدولسەلامر عارف بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک ئاگربەست لەلایەن سەرکردایەتی کورد ڕاگەیەنرا، تا هەڵویستی حکومەتی نوێیان بۆ ڕوون دەبێتەوە. هاوکات حکومەتی عێراقی دوای لەکاتی ئەنجامدانی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی بالای بەرگری، فەرماندەی تیپی یەک و فەرماندەی تیپی دوو(ئیبراهیم فەیسەڵ ئەنساری) لەدژی دەستپێکردنەوەی پرۆسە سەربازییەکان بوون. دیارە ئەمر دوو تیپە سەربازییەش لە هێلێ پیشەوەی پرۆسە سەربازییەکانی باکوورن، بەڵام فەرماندەکانیان هەست بە دوو دڵی دەکەن لەبەرامبەر ورەی سەربازەکانیان. لەبەرئەوەی لەماوەی سێ هەفتەی دوایی، ڕووبەڕووی سێ شکستی سەربازی گەورە بوونەوە لەبەرەی (پێنجوێن) چەندین سەربازی عیراقی کوژران لەکاتی هیرشکردن بۆ سەر ئەمر شارۆچکەیە و ناوەکانیان لە ئێزگەی کوردی شۆڕش خوێندرایەوە. سەرچاوەکانی هەواڵ ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، لەو کاتەی سەربازەکان فەرمانی هیرشکردنیان بۆ هاتووە بۆ سەر ناوچەکانی دەوروبەری کەرکووک، بەگشتی ڕایان کردووە. دیارترین ئەو سەربازانەی دژی بەشداریکردنن لە شەڕی کورد، موسڵمانە شیعە مەزهەبەکانن، کە زۆرینەی سوپای عێراقی پێک دەهێنن. شیعەکانی عیراق داوای کۆتاییهێنان بەشەڕ دەکەن لە دژی کورد".( مەعاریف، ١٩٦٤/4/19، ل2).

ئەمر بارودۆخە هاندەر بوو بۆ حکومەتی عێراقی هەوڵبدات بۆ دۆزینەوەی ڕێگە چارەسەرێکی ئاشتییانە بۆ دۆزی کورد لە عێراقدا. بەو هۆیەوە وەک ڕۆژنامەی مەعاریف لە (٢٢ی نیسانی ١٩٦٦) بابەتێکی بڵاوکردۆتەوە تیایدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئێستا دانوستاندن لەنێوان سەرۆک وەزیرانی عێراق و ڕێبەری کورد مەلا مستەفا بارزانی دەست پێدەکات بۆ دۆزینەوەی ڕێگەیەکی ئاشتیخوازانە بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد. مۆسکۆ پیشنیازی کردوە کۆبوونەوەی هەردوو لایەن لە ناوچەیەکی بێ لایەن ئەنجامر بدرێ، بەلام حکومەتی عێراقی ئەمر پێشنیازە ڕەت دەکاتەوە، لەبەرئەوەی حکومەتی عێراقی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە بابەتەکە پرسێکی ناوە خۆییە. تەنانەت ڕایگەیاندووە کە سەرکردە کوردەکانیش ئەمر پیشنیازەیان پێ پەسەند نیە (مەعاریف ، 1966/4/22، ل1).

لەمر سۆنگەوە بەپێی هەوالێکی دیکەی ڕۆژنامەکە کە لە (١ی تەمموزی ١٩٦٦) بڵاوکراوەتەوە، کە گوایە شاندی کوردی بە نوێنەرایەتی مەلا مستەفا بارزانی دەچێتە بەغدا بۆ ئەنجامدانی گفتوگۆو دانوستاندن لەگەڵ حکومەتی عێراقی، بەڵام سەبارەت بە چوونی مەلامستەفا بەمەبەستی گفتوگرکردن تەنیا لێدوانی ڕۆژنامەکە بووە،لەبەر ئەوەی وەک زانراوە هیچ سەرچاوەیەکی دیکە ئاماژەی بەمر لایەنەوە نەکردووە، هەر وەک رۆژنامەکە دەنووسێت. : وەک زانراوە شاندە کوردییەکە داوای تەرخانکردنی بودجەیەک بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستانی دەکات کە لە (١٥) ملیۆن دۆلار کەمتر نەبێ و لە(٤٢) ملیۆن دۆلاریش زیاتر نەبێ. سەرباری داواکانیان بۆ ئازادکردنی گیراوە سیاسییەکانی کورد و گەشەپیدانی پەروەردە و خوێندنی زمانی کوردی لەناوچە کوردییەکان. گواستنەوەی هەموو ئەو عەرەبانەی بەر لە (٣) گوسترابوونەوە ناوچە کوردییەکان لە چوارچیوەی پرۆسەی (تەعریب). تێکەڵکردنی جەنگاوەرانی کورد کە ژمارەیان (١٠) هەزار کەس بوو بە سوپاو پۆلیسی عێراقی. لەناوچە کوردییەکاندا خزمەت بکەن. هاوکات هەندێ گوندی دەوروبەری شاری موسڵ کارگێرییەکی خۆجێیەتی پێ بدرێت، بەڕەزامەندی سەرکردایەتی کورد. بەڵام ئەو خودموختارییەی سەرکردایەتی کورد داوای دەکرد بەلای حکومەتی عێراقی بەمانای دامەزراندنی دەولەتێک دەهات بۆ کورد لەنێو دەولەتی عێراقیدا لەلای دەسەڵاتدارانی بەغدا. هاوکات کوردەکان داوای پشکیان کرد لە داهاتی نەوتی عێراق کە لەزەوییەکانی نێو ناوچەی کوردییەکان بەرهەمر دێن. بەڵام دانوستانەکان بەرەو شکستهێنان چوون"، لە کاتێک ئیزگەی بەغدا ڕاگەیەنراوێکی جەلال تالەبانی بڵاوکردەوە کە

لەسەربازگەی بارزانی کشاوەتەوە. سەرباری ئەوەی شاندی کوردی خەریکی دانوستاندن بوون لەگەڵ حکومەتدا (مەعاریف ، 1966/7/1، ل23).

دەکرێت بووترێت هەرچەندە ڕۆژنامەی ناوبراو، بەدرێژایی ماوەی هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد، هەمیشە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ، هەواڵەکانی بارودۆخی شەڕ و جموجۆڵە سیاسی و هەڵویستی نیودەوڵەتی و وڵاتانی هەرێمی بەرامبەر شۆڕشەکە بڵاودەکردەوە، بەڵام لە تەمموزی ١٩٦٦ بۆ یەکەمجار بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە ڕێگای بلاوکردنەوەی دیدارێکی ڕۆژنامەنووسێکی ئینگلیزی بەناوی (لورد کیلبراکن)ی بەناونیشانی (من میوانی بارزانی بووم )لە ڕۆژی(٢٩ی تەمموزی١٩٦٦) بڵاوکردەوە و دیدارەکە (٣) لاپەڕەی تەواوی ڕۆژنامەکەی داگیر کرد. ڕۆژنامەنووسەکە تەواوی ووردکارییەکانی سەبارەت بە گەشتەکەی بۆ ناوچە شاخاوییەکانی ژێر دەسەڵاتی جەنگاوەرانی کوردی لایەنگیری مەلا مستەفا بارزانی، لە بابەتێکدا خستۆتەڕوو، سەرباری سێ دیداری کە لە (٣) ڕۆژی جیاواز لەگەڵ بارزانی ئەنجام داوە. لەم دیدارانەدا، بارزانی تیشکی خستۆتەسەر هەڵوێستی خۆی و سەرکردایەتی شۆڕش، بەرامبەر سیاسەتی حکومەتی بریتانیا و بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی و لەمیانەی باسەکەیدا دەڵێت:" داهاتی عێراق لە بیرە نەوتییەکانی کەرکوک سالانە دەگاتە(٢٢) ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی، هەمووی ئەو قازانجە لەلایەن کۆمپانیا ئەوروپی و ئەمریکییەکانەوە سوودی لی وەردەگیرێ، لە کاتێکدا ئەم بیرە نەوتیانە لەناو خاکی کوردە، ئێمە بەشمان تێدا نییە، سەرباری ئەمەش حکومەتەکانی سوود لە داهاتی زەویەکانی ئێمە وەردەگرن، چەک و تەقەمەنی بە حکومەتی عێراق ئەدەن بۆ لەناوبردنی کورد بەتایبەتی حکومەتی بەریتانیا، بۆیە هۆشداری بە حکومەتەکەت دەدەم، کە دەمێکە من ڕێگری دەکەم لەم پێشنیازانەی داوای تەقاندنەوەی بیرە نەوتییەکانی کەرکووک دەکەن، بە مەبەستی ڕاگرتنی هەناردەکردنی نەوت بۆ دەرەوەی عێراق، ئەگەر حکومەتەکەت دەست هەڵنەگرێ لە چەکدارکردنی سوپای عێراقی بەچەکی ئینگلیزی، بە دڵنیاییەوە ئەو کارە ئەنجام ئەدەین و تەواوی بیرە نەوتییەکانی کەرکوک دەبنە ئامانجی هێزە شۆڕشگێرە کوردەکان"(مەعاریف، 1966/7/29، ل 35,36,37.).

بەپێی ڕاپۆرتێکی دیکەی هەوالی ڕۆژنامەنووس (شموئیل شاک)ی پەیامنێری ڕۆژنامەی (مەعاریف)ی ئیسرائیلی، کە لە (٧ی ئابی ١٩٦٦) بڵاویکردۆتەوە، لە ئێوارەی ڕۆژی پیشووتر، سەرۆک وەزیرانی عێراق عەبدوڵڕەحمان بەزاز(٢١ی ئەیلوولی ١٩٦٥-٩ی ئابی ١٩٦٦) لە پۆستدابووە. دوای ئەوەی نامەی دەست لەکارکیشانەوەی خۆی پیشکەشی سەرۆکی عێراق کردووە. ئەمەش گورزێکی کوشندەبوو بەر دۆزی کورد لە عێراق کەوت، دوای ئەوەی بەزاز لە حوزەیرانی ١٩٦٦ بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە و تیایدا بەڵێنیدا بە مسۆگەرکردنی بەشێک لەمافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد لە حوکمەتەکەیدا. بەلام ئەم دەست لەکارکێشانەوەیە، جارێکی دیکە دۆخی ئاشتی و سەقامگیری سیاسی و دانوستان و گفتوگۆی نیوان حکومەتی عێراق و سەرکردایەتی کوردی ئاوەژۆکرد و بەو هۆیەوە جارێکی دیکە دۆزی کورد ڕووبەڕووی قەیرانێکی دیکەی سیاسی هاتەوە، دوای ئەوەی ناسیۆنالیستە عەرەبییە توندڕەوەکان لە نموونەی کەسێکی وەک (ناجی تاڵیب)، بە سەرۆک وەزیارنی نوێی عێراق دامەزرا (مەعاریف، 1966/8/7، ل2) وەک ڕۆژنامەنووس (شەموئیل سیجیف) ئاماژەی پێکردوە، سەرۆک وەزیرانی نوێی عێراق، هەرچەندە رایگەیاند کە رێز لە رێکەوتنی حکومەتی پیش خۆی لەگەڵ کورد دەگرێ و دوای ئەوەی کابینەی نوێی حکومەتی پێکهێنا لە کۆی (١٨) وەزیری حکومەت، (٢) وەزیری کوردی هەڵبژارد بۆ حکومەتەکەی کە پیشتر لە حکومەتی عیراقی خزمەتیان کردبوو یەکێکیان (فوئاد عارف) بوو(مەعاریف ، 1966/8/10، ل3). بەو هۆیەوە وەک ڕۆژنامەکە لە (١٩ی کانونی دووەمی ١٩٦٧) بلاویکردۆتەوە، پەیوەندی نیوان هەردوو لایەن دووبارە بەرەو ئاڵۆزی چوو، ئەمەش لەو بانگەوازە بەدیار دەکەوێ، کە نوێنەری مەلا مستەفای بارزانی ڕێبەری کورد لە لەندەن، ئاراستەی حکومەتی بریتانیای کردوە بۆ دەست هەڵگرتنی لە پاڵپشتیکردنی سەربازی بۆ حکومەتی عێراقی(مەعاریف، 1967/1/19، ل2).

لە دوای کۆتاییهاتنی جەنگی نێوان عەرەب و ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٦٧ (أورین،2005، ص٤٩٨). ڕۆژنامەی مەعاریفی ئیسرائیلی هەڵوێستی پشتگیری ئاشکرایی حکومەتی وڵاتەکەی لەڕێگای بابەتێک لە نووسینی (برود میری) بەناونیشانی (داوای دووەم، شکستپیهێنانی کورد) لە ڕۆژی (١ی کانونی یەکەمی ١٩٦٧) بڵاوکردەوە. لەم بابەتدا نووسەر بەشێوەیەکی ئاشکراو ڕوون هێرش دەکاتە سەر حکومەتە عەرەبییەکانی دژایەتی خواستی گەلی کورد دەکەن بۆ سەربەخۆیی( مەعاریف ،1967/12/1، ل17).

دواجار پەیامنێر چالاکەکەی ڕۆژنامەی مەعاریف، (شموئیل سیجیف) لە هەواڵێکدا بەناونیشانی (گروپی بەعس دەست بەسەر دەسەڵات دەگرێ) لە ڕۆژی (١٨ی تەمموزی ١٩٦٨) بڵاویکردووەتەوە کە دەڵێت:" دوێنی زرێپۆشەکان هاتنە نێو شەقامەکانی بەغدا ، بۆ جاری چوارەم لەماوەی (١٠) ساڵدا، ئەفسەرە سەربازەکان، لەماوەی چەند کاتژمێرێک، نەیارەکانیان لەسەر دەسەڵات دووورخستەوە...کودەتا سەربازییەکە، کۆتایی بەرژێمی عەبدوڵرەحمان عارف هێنا، لە کاتێکی درەنگی شەو ئەنجام درا، بەڵام خەڵکی بەغدا تا بەیانی پێی ئاگادار نەبوون. ئێزگەی بەغدا لە کاتژمێر(٦)ی بەرەبەیان، دوای پەخشکردنی چەند ئایەتێک لە قورئانی پیرۆز، دەستیکرد بە پەخشکردنی سروودی سەربازی. ئەنجوومەنی کودەتاچی لە ڕاگەیەنراوی یەکەمیاندا، ڕایانگەیاند کە بە ئەنجامدانی

چاکسازی کشتوکاڵی، پیادەکردنی سیاسەتێکی نەوتی سەربەخۆ و چارەسەرکردنی دۆزی کورد " بۆ دژایەتیکردنی گەندەڵی و دادگاییکردنی گەندەڵکاران. دەست بە ئەنجامدانی چالاکی سیاسی دەکەن لە عێراق (مەعاریف ،1968/7/18، ل2). ئەمەش بەمانای بەئاگابوونی رۆژنامەکە هاتووە لە ڕەوش و گۆرانکارییەکانی ناوچەکە، خستنە ڕووی هەندێ لە زانیارییەکان بەبێ لێکدانەوە و هەڵوێست دەربڕین.

**ـئەنجام:**

لە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەکی وورد سەبارەت بە ڕەنگدانەوەی دۆزی کورد لە ڕۆژنامەی (مەعاریف)ی ئیسرائیلی، گەیشتینە ئەم چەند دەرئەنجامانەی خوارەوە:

١-رۆژنامەی مەعاریف یەکێکە لە بڵاوکراوە فەرمییەکانی جیهان بەشێوەی ئاشکرا دەرچووە، لەگۆشەی تایبەتەکانیدا هەواڵی هەمەجۆرەی سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیری گشتی گواستووەتەوە، لە بواری کارکردنیدا دەستەیەکی کارا و بەئەزموونی هەبووە.

٢--گرنگی دانی ڕۆژنامەی مەعاریف بۆ دۆزی کورد ڕەنگدانەوەی سیاسەت و ڕەوشی ناوچەکە بووە، شتیکی تاکەکەسی یان پەیوەندییەکی نەتەوەیی و هاوسۆزی نەبووە، زیاتر لە چوارچێوەی ڕەوش و سیاسەتی وڵاتان بووە ، هەر بۆیە هەڵوێستەکانیش بەپێی قۆناغ و ڕووداوەکان گۆرانی بەسەرداهاتووە.

٣-- ڕۆژنامەکە کاریگەریی ئەرێنی لە خستنە ڕوو و لێکدانەوەی ڕەوشی کورد و پەیوەندییەکانی نێوان حکومەت و لایەنی کوردی هەبووە، ئەمەش بەهۆی زۆری گرنکی دانی بەمەسەلەی داتاو کردە سەربازییەکان،

٤- بەپشت بەستن بە دەق و لێدوانەکانی ڕۆژنامەکە دەردەکەوێت کە تاڕادەیەکی زۆر سەرکەوتوو بووە، لە ناساندن و گواستنەوەی دۆزی کورد لە گۆشەی هەواڵی ناوخۆییەوە بۆ هەواڵی جیهانی، ئەمەش بە خاڵێکی ئەرێنی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد دادەندرێت.

**لیستی سەرچاوەکان:**


**١- کتێب:**

- أحمد، محمود رزوق.(٢٠١٤)، الحركه الكرديه فی العراق(دور البارزانيين فی طريق الحكم الذاتی1918-1968)، دار المعتز للنشر والتوزيع، عمان.

أورين، ميشيل ب.(٢٠٠٥)،

-سته أيام من ألحرب، نقله ألى العربيه: أبراهيم ألشهابی، ط2b، ألرياچ.

-علی، عثمان.(٢٠١١)، الحركةالكردية المعاصره(دراسه تاريخية ووپائقية183-1946)، ڤ3، التفسير، أربيل.

-عبدالطلب، د.أبراهيم. (2015)، العراق البلد العربی الذی نخرا السياسيون 1914-2003، دار المعتز للنشر والتوزيع، عمان.

**٢- توێژینەوەی زانستی:**

**بە زمانی ئینگلیزی**

-Shinar, D. (1982). The portrayal of the elderly in four newspapers. Journalism Quarterly, 59(1), .111-91Israeli daily.

بە زمانی عیبری

-קרניאל, י., & דינור, ע. ל. (2009). " Yellow Press" In Israel? The Coverage of Prime Minister Ariel Sharon's Illness in Three Israeli Dailies/ עיתונות צהובה בישראל? סיקור מחלתו של ראש הממשלה שרון בשלושה עיתונים יומיים. קשר, 25-33. https://www.jstor.org/stable/i23918610?typeAccessWorkflow=login.

**٣- گۆڤار و ڕۆژنامە:**

**•ڕۆژنامە: (کوردی) :**

**- کوردستان:**

-ژ(١)، ١٩٦١/٣/٤. وەرگیراوە لە:کوردستان ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەیە، کاری هاوبەشی ئامادەکردن و پێشەکی: پ.د. هیمداد حوسێن ، لێکۆڵینەوە: نەوزاد عەلی ئەحمەد، چاپخانەی پیرەمێرد، ٢٠١٩.

**• ڕۆژنامەی عیبری:**

مەعاریف- ڕۆژنامەیەکی سیاسی ڕۆژانەی ئیسرائیلییە و لە تەلئەبیب دەردەچێ.

- ژەنەڕاڵەکانی بە ڕەچەڵەک کورد. ڕێکخستن بە شێوازی تورکی، ڕاهێنان، چاپی بەرلین، (ژمارە ١٠)، ١٩٤٨/٨/٥.

- ئەلیزەر بەدەمشا، کارتی کوردی یەکێتی سۆڤیەت (ژمارە: ٤٢٨٣) ،١٩٥٨/٧/٩

- ئەلیزەر بن موشێ، بارزانی بۆمبی ئامادەکراوی سۆڤیەتە (ژمارە 1343) ١٩٥٩/٤/٢٤ کرد.

- شموێل سێجێف، ژەنەڕاڵ قاسم، بەهۆی یاخیبوونی کوردەوە زیاتر زیانی پێگەیشت. (ژمارە 5200)، ١٩٦١/٩/١٨

- (ژمارە ٥٢٠٣)، ٢٢ی ئەیلوولی ١٩٦١

- (ژمارە 5207)، 28/9/، 2019.

- بن حەیف، كوشتنی هەزاران كورد لە عێراق، ژمارە (٥٢١٦)، ١٩٦١/١/١٠
- دیسان یاخیبوونی كورد لە عێراق، (ژمارە:5286)، 1961/١٢/٣١
- دەیڤیدی لانكاشایر، كاتێك شەڕی یاخیبووانی كورد دەستی پێكردەوە؛ (ژمارە:5287)، 1/1/،1962.
- دەمیز گێچینەر، یاخیبوونی كورد لە دوای سەرهەڵدانییەوە، (ژمارە:5396)،1962/٥/١٣
- ڕێوفین شموع، لە عێراق نێردراوە بۆ شەڕی كورد، (ژمارە:5401)، 1962/18/5
- (ژمارە:5512)، ٢٤/٩/،1962
- ساموێل شەغاب، سەرۆكی دەستەی بەڕێوەبەری دامەزراوەی سەربازی، (ژمارە ٥٦٣٠)، ١٩٦٣/١٠/٢.
- حكومەتی نوێی عێراق لە ڕق و كینە بەرامبەر كۆمۆنیزم یەكگرتووە، بەڵام لە پرسی هاوسۆزی بۆ ناسری دیكتاتۆری میسر دابەش بووە (ژمارە 5633)، 1963/٢/١٣.
- یاداشتنامەی لێكتێگەیشتن، بەڵگەنامەكانی حكومەتی هیندستان، (ژمارە 5635)،1963/٢/١٥.
- یاداشتنامەی لێكتێگەیشتن لە نێوان حكومەتی هیندستان و عێراق (ژمارە 5640) لە بەرواری 1963/2/21.
- دانوستانەكان شكستیان هێنا (ژمارە 5713) 1963/٥/٢٠.
- فەرەنسا ڕێككەوتنەكەی لەگەڵ عێراق پەسەند كرد، (ژمارە:5734)، 1963/٦/١٤.
- كورد ئاگری لە بیرە نەوتیەكان بەردا، (ژمارە:5738)،1963/٦/١٩.
-سوپای توركیا ڕەوانەی سنووری عێراق دەكرێت، (ژمارە:5747)،1963/٦/٣٠.
-زڤی لێڤی ئەندامانی بنەماڵەی گابای لە شاری مێرات باسی پەیوەندی ڕابردوویان لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی دەكەن (ژمارە ٥٧٥٢)،١٩٦٣/٧/٥.
- (ژمارە:5802)، 9/3/،1963
-مەنگۆلیا عێراقی بە قڕكردنی گەلی كورد تۆمەتبار كرد، (ژمارە:5826)، 1963/١٠/٢.
- نێوەندگیری میسر و ئاشتەوایی سۆڤیەت بووە هۆی ئاگربەستێكی تایبەت، (ژمارە:5940)، 1964/٢/١٤
- (ژمارە:6238)، ٢/٥/،1965
-(ژمارە:6278)، 3/14/،1965
- ناسر دوای ئەو ململانێیەی كە لە سەركردایەتی كورددا سەریهەڵدا، لە عێراق. باوەڕیان بەوە هەیە كە كاتی ئەوە هاتووە، هەڵمەتێكی نوێ دەستپێبكەن و ٤٠ هەزار سەرباز كۆبكەنەوە بۆ سەركوتكردنی بەرخۆدانەكانیان. (ژمارە ٦٣٠٣)، ١٩٦٥/٤/١٢
ژمارە(6310)، 4/20/،1965
ژمارە(6312)، 4/22/،1965
ژمارە(6320)، 5/3/،1965
- ڕیچارد شیپتۆن و سەرۆك عارف و سەرۆكوەزیران پیس پشتگیری لە یەكلاییكردنەوەكە دەكەن (ژمارە ٦٦١١) لە ١٩٦٦/4/19.
- ژمارە(6614)، 4/22/،1966
-ژمارە(6671)، 7/1/،1966
-ژمارە:6673)، 7/4/،1966-
-من میوانی بارزانی بووم ، (ژمارە:6695)، 1966/٧/٢٩
- ژمارە(6702)، 8/7/،1966
- شموێل سێجێڤ، بازرگانان. قوتابخانەی چوارەمی پەروەردە لە كوردستان، عێراق، (ژمارە:6705)، 1966/10/8.
- سەركردەی كورد ، داوای پشتیوانی لە لەندەن دەكات ، (ژمارە:6840)، 1967/1/19
- ڕەهاڤ مێیری، "داوای دووەم دەكەین" - شكستی كورد - بەیت دایگ ئیسرائیلی، (ژمارە:7103)، 1967/12/1
- شموێل سێجێڤ، فراكسیۆنی "بات" كە تونە دەگرێت، (ژمارە:7297)، 1968/٧/١٨.

**Kurdish issue in the newspaper Ma'arif Israeli in (1961-1968) Reflection of the**

**Qaraman Haydar Rahman**
Department of History, College of Arts, Salahaddin University - Erbil
Qaraman.rahman@su.edu.krd

**Arazu Yousf Hasan**
Department of History, College of Arts, Salahaddin University - Erbil
Arazu.hasn@su.edu.krd

**Abstract**
This research on the Kurdish issue in the newspaper Ma'arif during the years (1961-1968) emphasizes the attitude and attention to the Kurdish issue in the newspaper Ma'arif, by highlighting the inner side of events within the news and data of the newspaper The research consists of an introduction and three topics. The first topic is a summary of the newspaper's, the method of publication and the editorial board. The second topic is the Kurdish issue in two periods The newspaper's position during the negotiations and the rapprochement between the Kurds and the government is presented, referring to the external position on this issue
**Keywords;** Newspaper Ma’arif, Attitude, War, Government of Iraq.

**انعكاس القضية الكردية في جريدة المعاريف الاسرائيله (1961-1968)**

**قارمان حيدر رحمان**
**قسم التاريخ، كلية اداب، جامعة صلاح الدين- اربيل**
**Qaraman.rahman@su.edu.krd**

**أرزو يوسف حسن**
**قسم التاريخ، كلية اداب، جامعة صلاح الدين- اربيل**
**Arazu.hasn@su.edu.krd**

هذا البحث حول القضية الكردية في جريده المعارف خلال الأعوام (1961-1968) على الموقف والاهتمام بالقضية الكردية في جريده المعارف، مـن خـلال الجانب الداخلى للأحداث ضمن أخبار وبيانات الجريدة معاريف. البحث يتكون من مقدمة و ثلاثة مباحث. المبحث الأول: ملخص عن الصحيفة المعارف و طريقة النشر وهيئة التحرير. أما الموضوع الثاني فهو القضية الكردية في فترتين وتعرض موقف الصحيفة خلال المفاوضات والتقارب بين الكرد والحكومة مشيرة إلى الموقف الخارجي من هذه القضية.
**الكلمات المفتاحية**، الكرد، صحيفة المعاريف، موقف، حرب ، الحكومة العراقية.